ئاستی سێیەم

# تیسیر الرحمن

## لە زانستی جوان خوێندنەوەی قورئان




نوسین وئامادەکردنی
توفیق صدیق حمد

مۆڵەت پێدراو لە قیرائەتی ئیمام(عاصم) بەهەردوو
ریوایەتی (شعبة) و (حفص)



ناوی کتێب : ( تيسير الرحمن ) له زانستی جوان خوێندنەوەی قورئان

نووسین و ئامادەکردنی : توفیق صدیق حمد

ژماری لاپەرە : ٢٤٤ لاپەڕە

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە سپاردنی ( ٦٧٥ )ی ساڵی ٢٠١٤ی پێدراوە

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# پێشەکی

﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَ ، تَبَارَكَ ٱلَّذِى جَعَلَ فِى ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَجَعَلَ فِيهَا سِرَٰجًا وَقَمَرًا مُّنِيرًا ، وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ خِلْفَةً لِّمَنْ أَرَادَ أَن يَذَّكَّرَ أَوْ أَرَادَ شُكُورًا ﴾،

والصلاةُ والسلامُ على سيّدِ الخَلْقِ وَحَبِيبِ الحقِّ سيدِنا محمدٍ المُنَزَّل عليه القرءان ، وعلى آلِهِ وأصحابِهِ المُتبَتِّلِينَ الى بارِءِهِمْ تبْتِيلا ، والذين اتّخذوا القرءان مَنْهَجاً وسبيلاً ، فَصَدَقُوا ما عاهَدُوا اللهَ عليهِ وما بدّلوا تَبْدِيلاً ، ومن سارَ على نَهْجِهِم فكان أشدَّ الْتِزاماً وأقْوَمَ قيلًا.

أما بَعْدُ:

**سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگار کە قورئانی پیرۆزی بۆ سەر بەندەی خۆی محمد ( ﷺ ) ناردووەتە خوارەوە و کردوویەتی بە ڕووناکی و شیفای دڵەکان ، سڵاو لەسەر پێغەمبەر ( ﷺ ) و یاوەران و بنەماڵە و شوێن کەوتووانی، ئەوانەی بە ڕاستی پەیرەویان لێ کردوەو لێی دەکەن تا ڕۆژی دوایی ، پاشان هەموو سوپاس و ستایشێك بۆ خوای پەروەردگار...**

وا جارێكی تریش خوای گەورە یارمەتی داین بۆ تەواكردنی ئەو بەشەی كە مابو لە حوكمە كانی ( التجويد ) وە ك حوكمی ( لامی ساكن و جۆرەكانی تێك هەڵكێشان و درێژكردنەوە و وەستان و دەست پێكردن .... هتد ) كە هەولمان داوەبەشێوەیەكی ئاسان باسی لێوە بكەین.

لە رێگای دروست كردنی خشتە و رەنگ كردنی بابەتەكان لەگەڵ چەند تێبینی و روونكردنەوە یەك كە پێویستە فێرخواز ووریا بێت لێیان كەبە شێوازێكی ئاسان باسمان كردوون ، بۆ ئەوەی فێرخواز زیاتر گرنگی ئەو زانستەی بۆ ئاشكرا بیٚ كە دەیخوێنێت ، لەم پەرتوكەدا كە بەناوی ( تيسر الرحمن له زانستی جوان خوێندنەوەی قورئان )ە بەهیوای سودگەیاندن بە فێرخوازان و هەڵگرانی قورئان بۆ ئەوەی زیاتر شارەزای جوان خوێندنەوەی قورئان بن و ببن بەهاوەڵی قورئان هەروەكو پێغەمبەر ( ﷺ ) دەفەرمویٚ :

( يُقالُ لِصَاحِبِ القُرآنِ : اقْرَأْ وَارْتَقِ وَرَتِّلْ كَمَا كُنْتَ تُرَتِّلُ فِي الدُّنْيا ،فإِنَّ مَنْزِلَتكَ عِنْدَ آخِر آيَةٍ تَقْرَؤُها )

أخرجه أبو داود في كتاب : الصلاة ، باب : استحباب الترتيل في القراءة( الحديث :١٤٦٤ ) وأخرجه الترمذي.......

( واتە دەگوترێت بە هاوڕیٚ ی قورئان ( لەكاتی چوونە بەهەشتدا ) قورئان بخوێنە و بەرز بەوە وەك چۆن لە دونیادا دەت خوێند بەڕاستی جێگەی تۆ لەبەهەشتدا لەگەڵ كۆتایی ئەو ئایەتانەیە كە ئەی خوێنی )

ئەمەش بەڕاستی سەربەرزی و شانازی یە بۆ قورئان خوێن کە باشترین پلە بەدەست دەهێنێ لە بەهەشت ، ئەگەر سەیری فەرموودە شیرینەکانی پێغەمبەر ( ﷺ ) بکەین ئاماژە دەکات بە ( أهل )ی قورئان لە لای خوای پەروەردگار کە لە دونیادا بەکەسەنزیك وتایبەتەکانی خۆیان دادەنێت لە نێو خەڵکدا.

بۆیە ئێمەش ئومێد دەکەین دۆستی قورئان بین ولە کەسە نزیك وتایبە تەکانی خوای بەخشندە و میهرەبان بین بۆیە دەڵێین (أهل) ی قورئان بەسێ هەنگاو خۆیان دەگەیەنن بەو پلە و پایە بەرزە ،

کە ئەمانەن :

١- خوێندنەوەی قورئان بەئامادەبونی دڵ و هەست کردن بەگەورەیی (الله).

٢-پاك کردنەوەی دەروون بە تێڕامان و ورد بونەوە لە ئایەتەکانی قورئان.

٣-کار کردن بە ئایە تەکانی قورئان بە هاوشێوەی خووڕەوشتی پێغەمبەر ( ﷺ ).

داواکارین لە خوای پەروەردگار ئەو سێ ئاستەی نووسیومانە لێمان قە بوڵ بکات و سوودبگەیەنێت بە کتێبخانەی کوردی وسوڵمانان بەگشتی ، وە داواکارین مامۆستایان و فێرخوازانیش نزای بەخێرمان بۆ بکەن و لە تێبینی یە بەسوودەکانیان بێ بەشمان نەکەن .

وه له كۆتايى دا داواكارين له خواى پەروەردگار گۆڕى تەنگ و تاريكمان بۆ ڕوناك بكاتەوه و لەگەڵ پێغەمبەران و ڕاست گۆيان و پياوچاكان و شەهيدان كۆمان بكاتەوه له بەهەشتى خۆى.

(اللهم آمين)

﴿ رَّبِّ ٱغْفِرْ لِى وَلِوَٰلِدَىَّ وَلِمَن دَخَلَ بَيْتِىَ مُؤْمِنًا وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَلَا تَزِدِ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا تَبَارًۢا ﴾

توفيق صديق حمد

تشرينى دووەم ١٥ / ١١ /٢٠١٥ م

صفر ٣ / ٢ / ١٤٣٦ ك

هەولێر

## کورتەیەك دەربارەی ژیانی ئیمامی ( عاصم )

ئیمامی ( عاصم ) یەکێکە لە حەوت ( ٧ ) قاریئەکان لە قیرائەتی (السبع) ، ناوی ئەبوبەکری ئەسەدی کوفیە ، ناوی باوکی (بەهدەلە) یە ( بَهدَلة )[١] ، ناسراوە بە ( ئەبوبەکر ) لە سەردەمی ( موعاویەی کوڕی ئەبی سوفیان ) خوا لێی ڕازی بێت لە دایك بووە ، وە بە چەند هاوەڵێکی پێغەمبەری خوا ﴿ ﷺ ﴾ گەیشتووە.

أ- شێوەی خوێندنەوەکانی قورئانی پیرۆز ی بە سەنەدێکی بەرز وەرگرتووە لەمانەی خوارەوە:

- أبو عبدُالرحمن السُلَمي.
- زُر بن حبيش بن حباشة الاسدي.
- أبي عمرو سعد بن الياس الشيباني.

یەکێك لە ڕێگاکانی ( سند ) گەیشتنی بە پێغەمبەری خوا ﴿ ﷺ ﴾ :

ئیمامی ( عاصم ) لە لای ( أبو عبدالرحمن السلمي ) خوێندوویەتی ئەویش لە لای ( أبي بن كعب ) و ( زيد بن ثابت ) و ( عثمان بن عفان ) و ( علي بن أبي طالب ) و ( عبدالله بن مسعود ) خوێندوویەتی ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێ بێت ، ئەوانیش لای پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ خوێندوویانە.

---

(١) وە هەندێك دەڵێن: ناوی باوکی ( أبی النَّجُود عبدالله ) بووە .

ب- تابیعی بووه و فەرموودەی لەمانە گێراوەتەوە: ( أبي رمثة رفاعة التميمي ، والحارث بن حسان البكري )، وە هەڵگری قورئان و سوننەت بووە ، سەرە لووتکەی خوێندنەوەی قورئان بووە لە کوفە ، سەرمەشقی قورئان خوێنە کان بوو ، خوێنەرێکی بە تواناو لێزان و دەنگ خۆش بوە لە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز .

ئەوکەسانەی لای ئەو قورئانیان وەرگرتووە وخوێندووە: ( أبوبكر شعبة بن عياش ، حفص بن سليمان [٢] ، وابان بن ثعلبة ، حماد بن سلمة ، سليمان بن مهران الاعمش ، ابو المنذر سلام بن سليمان ، سهل بن شعيب ، شيبان بن معاوية..... )

ج- سەرمەشقی قاریئەکانی وەرگرتووە لە کوفە، پاش (أبو عبدالرحمن السلمي) ( أبو بكر بن العياش ) ( رەحمەتی خوایان لێ بێت ) دەفەرموێت: کاتێك مامۆستاکەی ( أبو عبدالرحمن السلمي ) کۆچی دوایی کرد ( عاصم ) ناوبانگی دەرکرد و دانیشت بۆ قرائەکردنی قورئان بۆ خەڵك ، خەڵکی لە وولاتان دەهاتنە لای بۆ فێربوونی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز.

( أبو إسحاق ) دەفەرموێ : کەسم نەبینیوە وەك ( عاصم ) بەم شێوەیە قورئان بخوێنێتەوە، چونکە زانایە بە سونەت و زمانەوانی و٠٠٠٠٠ هتد.

---

(٢) ئەم دووانە ناودارترین راویەکانی ( إمام عاصم )ـن لە جیهان بە تایبەتی ( حفص بن سليمان ) کە لە زۆربەی وولاتان بەپیوایە تی ( حفص ) دەخوێنرێت.

عبداللەی کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) دەفەرموێت : پرسیاری (عاصم)م لە باوکم کرد فەرمووی : پیاوێکی چاکەو جێگای خێرو متمانەیە ، دوایی لێم پرسی : کام لە قیرائاتت لا خۆشە فەرمووی : هی خەڵکی مەدینە ، ئەگەر نەبوو خوێندنەوەی (عاصم)م لاخۆشە.

ئەبوبەکری کوڕی عیاش ( شعبة ) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەگێڕێتەوە کە (عاصم) پێی فەرمووە: دوو ساڵ نەخۆش کەوتم پاش ئەوەی چاك بوومەوە دەستم بە قورئان خوێندن کرد لە یەك پیتیش هەڵەم تیادا نەکرد.

لە کۆتایی ساڵی ( ١٢٧ )ی کۆچی ئیمامی ( عاصم ) کۆچی دوایی کرد، لە نزیك شاری ( سەماوە ) نێژراوە.


سيدنا رسول الله ﴿ﷺ﴾
أبي بن كعب
زيد بن ثابت
عثمان بن عفان
على بن أبي طالب
عبدالله بن مسعود
أبو عبدالرحمن السُلمي
زر بن حبيش
سعد بن إلياس
گەیشتنی سەنەدی پێشەوا ( عاصم ) بە پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾.
عاصم
حفص

# کورتەیەك لە ژیانی پێشەوا ( شاطبي )

پێشەوا شاتبی ناوی ( قاسم بن فيرة )یە، لە ساڵی ( ٥٣٨ ) کۆچی لە دایك بووە لە شارۆچکەی ( شاطبي )، کە ناوی شارێکە لە ڕۆژهەڵاتی ئەندەلوس ، چەند پەرتوکێکی نوسیووە لەوانە : (حِرزُ الأماني ووجه التهاني) کە پێك هاتووە لە ( ١١٧٣ ) دێرە هۆنراوە ، کە باسی زانستی ( قراءات السبع )[1] دەکات بە ڕێگای هۆنراوە ، بەم پەرتووکە ناسراوە بە ( شاطبي ) لە نێوان زانایان ، چەند نازناوێکی تری هەبوو وەك ( أبا القاسم ) زۆربەش بەم ناوە ناویان هێناوە ( أبو محمد القاسم ) لە سەر ڕاڕەو ( مذهب )ی ( إمام مالك ) بووە، بەڵام کە کۆچی کرد بۆ وولاتی ( مصر ) لەسەر ڕاڕەو ( مذهب )ی ( إمام شافعي ) جێگیر بووە.

زانایان دەربارەی ( شاطبي ) دەفەرموون کەسێکی دڵسۆز وچاك و ڕاستگۆ و زانا و وردبین و زیرەك بووە ، کەسێك بووە کە شارەزایەکی چاکی هەبووە لە : ( التفسير ، الحديث ، الفقه ، ...... هتد ) وە بە تایبەتی لە زانستی ( قراءات ) واتە چۆنیەتی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز بە هەموو ڕیوایەتەکان ، هەروەها شارەزایەکی چاکی لە زمانی عەرەبی و هۆنراوە ( شعر ) هەبووە ، بۆیە هۆنراوەکانیشی ئەوەندە بەهێزبووە کە بەڵگەیەکی ڕۆشن بووە لە بارەی شارەزا بوونی زمانی عەرەبی و ( شعر ) پێشەوا ( شاطبي ) زانایەکی دونیا نەویست بووە ، بە شەو شەو نوێژ و بە ڕۆژیش بە ڕۆژوو بووە.

---

( ١ ) قراءات السبع بریتی یە لە: ( نافع ) ئیمامی خەڵکی ( المدينة ) ، ( ابن كثير ) ئیمامی خەڵکی ( مكة ) ، ( ابي عمرو بن العلاء ) ئیمامی خەڵکی ( البصري) ، ( عاصم و حمزة والكسائي) ئیمامەکانی خەڵکی (الكوفة) بوون، و( ابن عامر) ئیمامی خەڵکی ( الشام ) بووە.

پێشەوا ( شاطبي ) نیشتەجێی وڵاتی (مصر) بووە لە پایتەختی ( قاهیرة ) و بەردەوام وانەی دەوتەوە لە قوتابخانەی ( فاضلیة ) وەسودێکی زۆری بە خەڵك گەیاندووە لەم قوتابخانەیە ، وەله بارەی هۆنراوەکانیشی زانستی ( قراءات ) دەیفەرموو : هەر کەسێك هۆنراوەکانی من بخوێنێتەوە بە دڵنیایەوە خوای گەورە سوودی پێدەگەیەنێت ، هۆکاری ئەم سوود بەخشینەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کاتێك هۆنراوەکانی دادەرشت مەبەستی تەنها خوای گەورە بووە ، کەسێك بووە زۆر کەم دەدوا ، قسەی نەدەکرد تاوەکو پرسیاریان لێ نەکردبایە .

هەر کاتێك مەبەستی بوایە دابنیشتبایە بە جوانی و بە ملکەچی دادەنیشت و رێك و پێك بوو لە دانیشتنەکەی ، لە دوای نوێژی بەیانیان خەڵکان بە گەرم و گوڕیی دەچوونە لای بۆ خوێندنی قورئانی پیرۆز.

هەرکاتێك نەخۆش بووایە شەکوای بۆ لای هیچ کەس نەدەکرد ، وەپرسیاری لێ بکرایە دەربارەی نەخۆشیەکەی دەیفەرموو : ( العافیة ) زیاتری نەدەوت.

پێشەوا ( شاطبي ) تەمەنی پیرۆزی ( ٥٢ ) ساڵ بوو کە وەفاتی کرد ، لە رۆژی یەك شەممە لە دوای نوێژی عەسر لە بەرواری ( ٥٩٠ هـ – ١١٩٤م ) وله رۆژی دووشەممە لە گۆڕستانی ( القاضي الفاضل عبدالرحیم البیساني ) لە وڵاتی ( مصر ) ناشتیان، وە گۆڕەکەی ناسراوە لە نێو خەڵك.

## ڕوكنەكانی ڕاست و دروست خوێندندنەوەی قورئانی پیرۆز

پێویستە خوێنەری قورئانی پیرۆز ئاشنا بێت بە ڕووكنەكانی خوێندنی ڕاست كە ئەمانەن :

١- یەككگرتنەوەی یاخود ڕێكەوتنی خوێندنی قورئانی پیرۆز بۆ ڕوویێك لە ڕووەكانی زمانی عەرەبی .

٢- ڕێكەوتنی هەبێت لەگەڵ وێنە و شێوەی ( مصحف العثماني ) ئەگەر بە گریمانەش بێت ( ولواحتمالاً ).

( المصحف العثماني ): بریتی یە لەو ( مصحف )ەی كە لە زەمانی (عثمان بن عفان ) نووسراوە ( العثماني ) خستنەپاڵ ئیمامی عوسمانە ( رەزای خوای لێ بێت )، چونكە شێوەی لە بەرگرتنەوەی ئەو پێی هەڵساوە ، وەهەڵسا بە رەوانە كردنی ( مصحف ) بۆ وولاتە ئیسلامییەكان لەگەڵ هەر ( مصحف )ێكی تایبەت كەسێكی لێزان وشارەزا ی بۆ فێركردنی خەڵك رەوانە كرد.

- ( زید بن ثابت ) خوێنەری ( مصحف )ی مەدینە بوو.
- ( عبدالله بن السائب ) رەوانەكرا لەگەڵ ( مصحف )ی مەككی.
- ( المغيرة بن شهاب ) رەوانەكرا لەگەڵ ( مصحف )ی شامی.
- ( أبو عبدالرحمن السُلمي ) رەوانەكرا لەگەڵ ( مصحف )ی كوفی.
- ( عامربن عبد القيس ) رەوانەكرا لەگەڵ ( مصحف )ی بەسری .

- مەبەست لە ( ئەگەر بە گریمانەش بێت ) ( ولواحتمالاً ) :

واتا خوێندنەکە هاوتا بێت لەگەڵ ئەو شێوەی یاخود وێنەی ( مصحف )ـەکە وەك ﴿ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴾ (ئەلیف)ـی ووشەی ﴿ مَٰلِكِ ﴾ کە لەگەڵ ئەوەی لە هەموو ( مصحف )ـە ( العثماني ) یەکان بەبێ ( ئەلیف ) نووسراوە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەم شێوەیە دەخوێندرێتەوە کە(ئەلیف )ـەکە نووسرابێت لە وێنەی (مصحف)ـە کە.

٣-ڕاست و دروستی سەنەد ( صحةُ الاسناد ) بریتی یە لە گواستنەوەی خوێندنەوەکە بە سەنەدێکی یەك لەدوای یەك ( المُتواتِر ) کە ژمارەیەکی زۆرلە خۆدەگرێتەوە لە گێرانەوەی وە دەبێت دوور بێت لە درۆ لە سەرەتای سەنەدەکە تا کۆتای وە ئەوەش بەو شێوەیە دەبێت کە خوێنەرەکە خوێندنەوەکە لە کەسێکی زانا و لێزان وەربگرێت کە سەنەدەکەی لە پێغەمبەرەوە هاتبێت ﴿ ﷺ ﴾.

**وە بۆ وەرگرتنی شێوەی خوێندن لە شێخ یاخود مامۆستای زانا ولێزان دوو ڕێگا هەیە :**

– قوتابی گوێی لە خوێندنەوەی شێخەکە یاخود مامۆستا کە بێت.

– قوتابی لە ژێر دەستی شێخەکە یاخوود مامۆستاکە بخوێنیٚ هەر لەبەر ئەمەشە کەخوێنەری قورئان ناتوانیٚ فێری حوکمەکانی (تەجوید) بێت تەنها بە کتێب خوێندنەوە بەڵکو دەبێت بگەڕێتەوە بۆ لای شارەزایان لەم بوارە کە ئەوانیش لە هاوشێوەی خۆیان بە هەمان شێوە فێری بوون لە ڕێگای وەرگرتن لیٚ یان و گوێبیست بوون لە دەمیا ن چونکە هەندێك شت هەیە نازانرێت تەنها بە گوێگرتن و لە دەم وەرگرتن نەبێت.

پێشەوا ( ابن الجزري ) ( ڕەحمەتی خوای لیٚ بێت ) دەفەرمویٚ :

فَكُلُّ مَا وَافَقَ وَجْهَ نَحْو    وَكَانَ لِلرَّسْم احْتِمَالاً يَحوي
وَصَحَّ إسْناداً هُوَالقُرْانُ    فَهَــذِهِ الثَّـلاثَةُ الارْكَـانُ
وَحَيْثُما يَخْتَلَّ رُكْنٌ أَثْبِتِ    شُذُوذَهُ لَوْ أَ نَّهُ فِي السَبْعَةِ

# خشتەی روونکردنەوەی بابەتە سەرەکیەکانی زانستی ( التجوید )



# حوكمەكانی لامی ( ساكن )

**( ألـ )ی ناساندن**
**( لام التعريف )**

- به دیار دەخستریٚ ( مظهرة )
  نموونه : ﴿ ٱلْقَمَرُ ﴾ القمر: ١
- تێك هەڵكێش دەكرێت ( مدغمة )
  ، نموونه: ﴿ وَٱلشَّمْسِ ﴾ الشمس: ١

**لامی كردار**
**( لام الفعل )**

- به دیار دەخستریٚ ( مظهرة )
  نموونه : ﴿ يُلْحِدُونَ ﴾ الأعراف: ١٨٠
- تێك هەڵكێش دەكرێت ( مدغمة )
  نموونه : ﴿ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ ﴾ الأحزاب: ٢٨

**لامی پیت**
**( لام الحرف )**

لامی ( سكون ) دەكەوێتە كۆتایی هەردوو پیت ( بل ، هل )

- به دیار دەخستریٚ ( مظهرة )
  نموونه: ﴿ بَلْ أَنتُمْ ﴾ النمل: ٣٦
- تێك هەڵكێش دەكرێت ( مدغمة )
  نموونه: ﴿ هَل لَّكَ ﴾ النازعات: ١٨

**لامی فەرمان**
**( لام الامر )**

لامی ( ساكن ) دەكەوێتە سەرەتا و كۆتایی كرداری ڕانەبردوو بە مەرج گیراوە پێش پیتی ( لام )ـەكە ، ( ثمّ ، واو ، فاء ) بێت ، نموونە :
﴿ ثُمَّ لْيَقْطَعْ ﴾ الحج: ١٥ ﴿ وَلْيُوفُوا نُذُورَهُمْ ﴾ الحج: ٢٩ ﴿ فَلْيَمْدُدْ ﴾ الحج: ١٥

**لامی ناو**
**( لام الاسم )**

لامی ( ساكن ) دەكەوێتە ناوەڕاستی ناو لە بنەڕەتی ووشەكە دایە نموونە:
﴿ سُلْطَٰنٍ ﴾ الأعراف: ٧١

# لامی ناسـاندن

## ( لام التعريـف )

بریتـی یـه لـه (الـ) کـه دەچێتە سـەر نـاوی ناساندن و عـەرەب لـە پـێش نـاوەوە دایـدەنێن بۆ ناسینەوەی ئەم (لام)ـە زیادەیـە کـە لـە بنـەڕەتی ووشـەکەدا نیـە ، تـەنها دەچێتە سـەر نـاوی نەناسـراو لـە نوسـیندا و هەمزەی گەیاندن لە پێش ( لام )ەکە دێت و لـە دەستپێکدا بە ( فتحة ) دەخوێندرێتەوە.

حوکمی ئەم جۆرە ( لام )ـە بە دوو شێوەیە :

١- الإظهار

٢- الإدغام

١- **الإظهار**: بە دیارخستنی ( لام )ـی ناساندن ( لام التعريف )

( لام )ـی ناساندن ( لام التعريف ) ئاشکرا دەکرێت ئەگەر هات و لە پێش ئەم چوارده ( ١٤ ) پیتە هات : ( ألف ، باء ، غين ، حاء ، جيم ، كاف ، واو ، خاء ، فاء ، عين ، قاف ، ياء ، ميم ، هاء )

ئیمامی جەمزوری ( ڕەحمەتی خوای لێ بێ ) پیتەکانی کۆ کردۆتەوە لەم ڕستە هۆنراوەیە: ( إِبغِ حَجَّكَ وَخَفْ عَقِيمَهُ).

نموونەی بە دیارخستنی ( لام )ی ( القمري ):-

| پیت | نموونەکان |
|---|---|
| الهمزة | ﴿ ٱلْأَرْضُ ﴾ الزلزلة: ١ ﴿ ٱلْأَنۢبِيَآءَ ﴾ النساء: ١٥٥ |
| الباء | ﴿ ٱلْبَٰطِلَ ﴾ الأنفال: ٨ ﴿ ٱلْبَرْقُ ﴾ البقرة: ٢٠ |
| الغين | ﴿ ٱلْغَفُورُ ﴾ سبأ: ٢ ﴿ ٱلْغَنِىُّ ﴾ الممتحنة: ٦ |
| الحاء | ﴿ ٱلْحَىُّ ﴾ آل عمران: ٢ ﴿ ٱلْحَكِيمُ ﴾ إبراهيم: ٤ |
| الجيم | ﴿ ٱلْجَبَّارُ ﴾ الحشر: ٢٣ ﴿ وَٱلْجَارِ ﴾ النساء: ٣٦ |
| الكاف | ﴿ ٱلْكَبِيرُ ﴾ الرعد: ٩ ﴿ ٱلْكَرِيمِ ﴾ الانفطار: ٦ |
| الواو | ﴿ ٱلْوَدُودُ ﴾ البروج: ١٤ ﴿ ٱلْوَعِيدِ ﴾ ق: ٢٠ |
| الخاء | ﴿ ٱلْخَبِيرُ ﴾ سبأ: ١ ﴿ ٱلْخَٰلِقُ ﴾ الحشر: ٢٤ |
| الفاء | ﴿ ٱلْفَآئِزُونَ ﴾ التوبة: ٢٠ ﴿ ٱلْفَوْزُ ﴾ التوبة: ٧٢ |
| العين | ﴿ ٱلْعَلِيمُ ﴾ الأنبياء: ٤ ﴿ ٱلْعَلِىُّ ﴾ الشورى: ٤ |
| القاف | ﴿ ٱلْقَمَرَ ﴾ نوح: ١٦ ﴿ ٱلْقَيُّومُ ﴾ آل عمران: ٢ |
| الياء | ﴿ ٱلْيَاقُوتُ ﴾ الرحمن: ٥٨ ﴿ ٱلْيَمِينِ ﴾ ق: ١٧ |
| الميم | ﴿ ٱلْمَوْلَىٰ ﴾ الحج: ١٣ ﴿ ٱلْمُلْكِ ﴾ الفرقان: ٢ |
| الهاء | ﴿ ٱلْهَوَىٰٓ ﴾ النجم: ٣ ﴿ ٱلْهُدَىٰٓ ﴾ الجن: ١٣ |

٢- **الادغام:** تێکهەڵکێش کردنی ( لام )ـی ناساندن ( لام التعريف )

( لام )ـی ناساندن ( لام التعريف ) تێك هەڵکێش دەکرێت و ناخوێندرێتەوە ئەگەر ئەم پیتانەی بە دوادا هات ( طاء ، ثاء ، راء ، تاء ، صاد ، ذال ، نون ، دال ، سين ، ظاء ، ضاد ، زاي ، شين ، لام ) بە تێك هەڵکێشانێکی تەواو بە بێ مینگە ( غنة ) جگە لە پیتی ( نون ) نەبێت مینگەی لەگەڵە.

ئیمامی ( جمزوري ) پیتەکانی کۆکردووەتەوە لە سەرەتای ووشەکانی ئەم دێرە هۆنراوە:

طِبْ ثُمَّ صِلْ رَحِماً تَفُزْ ضِف ذَانِعَمْ

دَعْ سُوءَ ظَنٍّ زُرْ شَرِيفاً لِلْكَرَمْ

## نموونەی تێک هەڵکێشانی لامی ( الشمسي ):-

| پیتەکان | نموونەکان |
|---|---|
| الطاء | ﴿ٱلطَّالِبُ﴾ الحج: ٧٣ ﴿ٱلطَّآمَّةُ﴾ النازعات: ٣٤ |
| الثاء | ﴿ٱلثَّرَىٰ﴾ طه: ٦ ﴿ٱلثَّوَابُ﴾ الكهف: ٣١ |
| الصاد | ﴿ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ الأعراف: ٧٠ ﴿وَٱلصَّٰبِرِينَ﴾ محمد: ٣١ |
| الراء | ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ﴾ مريم: ٧٨ ﴿ٱلرَّحِيمُ﴾ الحجر: ٤٩ |
| التاء | ﴿ٱلتَّوَّابُ﴾ البقرة: ٥٤ ﴿ٱلتَّٰٓئِبُونَ﴾ التوبة: ١١٢ |
| الضاد | ﴿ٱلضَّآلِّينَ﴾ الفاتحة: ٧ ﴿ٱلضَّلَٰلُ﴾ الحج: ١٢ |
| الذال | ﴿ٱلذِّكْرِ﴾ الأنبياء: ٧ ﴿وَٱلذَّٰكِرِينَ﴾ الأحزاب: ٣٥ |
| النون | ﴿ٱلنَّعِيمِ﴾ يونس: ٩ ﴿ٱلنَّٰصِحِينَ﴾ الأعراف: ٢١ |
| الدال | ﴿ٱلدِّينُ﴾ الزمر: ٣ ﴿ٱلدَّوَآبِّ﴾ الأنفال: ٥٥ |
| السين | ﴿ٱلسَّمَآءِ﴾ السجدة: ٥ ﴿ٱلسَّمِيعُ﴾ الدخان: ٦ |
| الظاء | ﴿ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ غافر: ٥٢ ﴿ٱلظَّآنِّينَ﴾ الفتح: ٦ |
| الزاى | ﴿ٱلزَّبُورِ﴾ الأنبياء: ١٠٥ ﴿ٱلزَّانِيَةُ﴾ النور: ٢ |
| الشين | ﴿ٱلشَّمْسَ﴾ الزمر: ٥ ﴿ٱلشِّمَالِ﴾ ق: ١٧ |
| اللام | ﴿ٱلَّيْلِ﴾ الأنعام: ١٣ ﴿ٱللَّٰتَ﴾ النجم: ١٩ |

## چەند تێبینی یەك لە سەر( الـ )ی ناساندن ( لام التعريف )

١-(الـ) ی ناساندن (لام التعريف) تەنها دەچێتە سەر ناو (اسم) ناچێتە سەر کار و پیت (فعل و حرف).

٢- ( الـ ) ی ناساندن ( لام التعريف ) بە هەندێك ووشەوە پەیوەستە نابێت لێی جیا بکرێتەوە ، چونکە واتای ووشەکە دەگۆرێت.

نموونە:

﴿ ٱلَّذِى ﴾ البقرة: ٢٢ ﴿ ٱلَّتِى ﴾ النساء: ٥ ﴿ وَٱلَّذَانِ ﴾ النساء: ١٦

﴿ وَٱلْيَسَعَ ﴾ الأنعام: ٨٦ ﴿ ءَآلْـَٔنَ ﴾ يونس: ٩١ ﴿ ٱلَّـٰٓـِٔى ﴾ الأحزاب: ٤

بۆ نموونە : تەنها ( ذي ) یان ( ذان ) یان ( تي ) یان ( ءان ) هیچ واتایەك نابەخشێ ، ئەم جۆرە ووشانە دەبن بە دوو جۆر ئاشکراو تێك هەڵکێش:

نموونەی ئاشکرا: ﴿ ءَآلْـَٔنَ ﴾ يونس ٩١،

نموونە ی تێك هەڵکێش : ﴿ ٱلَّـٰٓـِٔى ﴾ (*) الأحزاب: ٤

(الـ)ی ناساندن (لام التعريف) ئەگەر لە ووشەکە جیا بکەینەوە واتاکە ناگۆرێ:

نموونە: ﴿ ٱلْغَفُورُ ﴾ يوسف: ٩٨، بەبێ ( الـ ) ﴿ غَفُورٌ ﴾ التوبة: ٥

---

(*) بڕوانە (جداول أحكام التلاوة والتجويد) لاپەرە: ٤٦، (بغية المريد من أحكام التجويد) لاپەرە : ١٦٨، و (الدقائق المحكمات في المخارج والصفات) لاپەرە:٢٠٦، و ( المختصر الوافي من هداية القارىء إلى تجويد كلام الباري ) لاپەرە : ٦٩ — ٧٠.

٣- بۆیە ناویان ناوە بە ( الشمس )ی چونکە ووشەی شەمس (الـ)ی ناساندنی تیایە و ناخوێندرێتەوە ، واتە : هەر کاتێ (ڕۆژ) بە دیارکەوت ئەوا ئەستێرەش دیار نامێنێ کەواتە هەر کاتێ پیتی شەمسی هات (الـ)ی ناساندن ناخوێندرێتەوە.

٤-( الـ )ی ناساندن بەدیار ناکەوێت و ناخوێندرێتەوە ، بە پێچەوانەی ( الـ )ی ( القمري ).

٥-بۆیە ناویان ناوە بە ( القمري ) چونکە ووشەی قەمەر ( الـ )ی ناساندنی تێدایە و دەخوێندرێتەوە، واتە: هەر کاتێ (مانگ) بەدیارکەوت ئەوا ئەستێرەش دەردەکەوێت، وەك ئەوەی ئەگەر پیتی قەمەری هات (الـ)ی ناساندن دەردەکەوێت و دەخوێندرێتەوە، وەهەروەها بە پێچەوانەی (الـ)ی (الشمسي).

٦- بە دوو هێما لە قورئانی پیرۆز ( الـ )ی ناساندن بە دیار دەکەوێت و دەناسرێتەوە:

- لامی شەمسی هیچ هێمایەکی لە سەر نیە و لەگەڵ پیتەکەی دوای خۆی تێکهەڵکێش کراوە بە هۆی نزیکی شوێنی دەرچوونی لەگەڵ پیتەکەی دوای خۆی.

نموونە: ﴿ٱلشَّمۡسَ﴾ الزمر: ٥

- لامی قەمەری هێمای (سکون)ی لەسەرە کەوەك(حاء)ێکی بچووکە، نیشانەی ئاشکراکردنی لامی قەمەریە و لەگەڵ پیتەکەی دوای خۆی بەهۆی دووری شوێنی دەرچوونی پیتەکەی دوای خۆی.

نموونە: ﴿ٱلۡقَمَرَ﴾ نوح: ١٦

## ٢- لامی کار ( لام الفعل ) :

بریتی یە لە لامی ( ساکن ) کە دەکەوێتە ناوەڕاست و کۆتایی ووشە ،حوکمی ئەم جۆرە ( لام )ـە بەدوو شێوازە:

أ- الاظهار　　　　ب- الادغام

### أ- الاظهار

پێویستە لامی کار ( لام الفعل ) ئاشکرا بکرێت ئەگەر لە پێش هەر پیتێك لە پیتەکانی زمانی عەرەبی هات ، جگە لە پیتی ( لام – راء ) ، جیاوازی نی یە ( لام )ی ( ساکن ) لە هەر بارێك بێت ڕابردوو بێ یان داهاتوو یان کاری داخوازی بێ.

## خشتەی نموونەی لامی کار ( لام الفعل )

| کاری ڕابردوو ( الفعل الماضي ) | | کاری داهاتوو ( الفعل المضارع ) | | کاری داخوازی ( الفعل الامر ) | |
|---|---|---|---|---|---|
| لە ناوەڕاستی ووشە | لە کۆتایی | لە ناوەڕاستی ووشە | لە کۆتایی | لە ناوەڕاستی ووشە | لە کۆتایی |
| فَٱلْتَقَى<br>القمر: ١٢ | فَضَّلْنَا<br>البقرة: ٢٥٣ | وَلَا يَلْتَفِتْ<br>هود: ٨١ | أَلَمْ أَقُلْ<br>البقرة: ٣٣ | وَأَلْقِ مَا فِي<br>طه: ٦٩ | قُلْ نَعَمْ<br>الصافات: ١٨ |
| فَٱلْتَقَمَهُ<br>الصافات: ١٤٢ | وَأَرْسَلْنَآ<br>المائدة: ٧٠ | يَلْتَقِطْهُ<br>يوسف: ١٠ | وَمَن يَقُلْ<br>الأنبياء: ٢٩ | وَٱلْعَنْهُمْ<br>الأحزاب: ٦٨ | فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ<br>آل عمران: ١٥٩ |
| وَزُلْزِلُوا۟<br>البقرة: ٢١٤ | أَنزَلْنَٰهُ<br>الإسراء: ١٠٥ | وَيَلْبَسُونَ<br>الكهف: ٣١ | فَمَن يَعْمَلْ<br>الأنبياء: ٩٤ | أَلْهَىٰكُمُ<br>التكاثر: ١ | فَقُلْ سَلَٰمٌ<br>الأنعام: ٥٤ |

ب- الادغام : -

( لام الفعل )ی سکوندار تێك هەڵكێش دەكرێت ئەگەر پیتەكانی ( لام و راء )ی بە دوا داهات.

| پیت | نموونەی تێكهەڵكێش كردنی پیتی ( لام ) |
| --- | --- |
| لْ + لَ | ﴿قُل لَّكُمْ﴾ سبأ: ٣٠ ، ﴿قُل لَّوْ كَانَ﴾ الإسراء: ٩٥ |
| لْ + رَ | ﴿وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا﴾ طه: ١١٤، ﴿وَقُل رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ﴾ المؤمنون: ٩٧ |

٣- لامی پیت ( لام الحرف ):-

بریتی یە لە لامی ( ساكن ) كە دەكەوێتە كۆتایی هەردوو پیتی ﴿ هَلْ - بَلْ ﴾ حوكمی ئەم جۆرە ( لام )ە دەبێت بە دوو بەش:

أ- الاظهار    ب- الادغام

ا- الاظهار:-

پێویستە لامی ( ساكن ) ئاشكرا بكرێت ئەگەر لە پێش پیتەكانی زمانی عەرەبی هات جگە لە پیتی ( لام و راء ).

نموونە: ﴿هَلْ تَعْلَمُ﴾ مريم: ٦٥ ، ﴿بَلْ ضَلُّواْ﴾ الأحقاف: ٢٨

| پیت | نموونەی ئاشكراكردنی پیتی ( لام ) |
| --- | --- |
| هَلْ | ﴿هَلْ نَحْنُ﴾ الشعراء: ٢٠٣ ، ﴿فَهَلْ تَرَىٰ﴾ الحاقة: ٨ |
| بَلْ | ﴿بَلْ زَعَمْتُمْ﴾ الكهف: ٤٨ ، ﴿بَلْ زُيِّنَ﴾ الرعد: ٣٣ |

## ب- الادغام:-

پێویستە تێك هەلكێش بكرێت لامی ( ساكن ) ئەگەر هاتوو پیتی ( لام - راء )ی بە دوا داهات .

| نمـــــوونـــــەكان | | |
|---|---|---|
| لامی پیت | لەگەڵ ( لام ) | لەگەڵ ( راء ) |
| هَلْ | ﴿هَل لَّكُم﴾ الروم: ٢٨ | نموونە نیە لە قورئان ﴿ هَلْ ﴾ پیتی( راء ) بە دوای داهات بێت |
| بَلْ | ﴿بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ﴾ النساء: ١٥٨ | ﴿بَل لَّمَّا يَذُوقُواْ عَذَابِ﴾ ص: ٨ |

## ٤- لامی ناو ( لام الاسم ) :-

بریتی یە لە لامی ( ساكن ) كە دەكەوێتە ناوەراستی ناو كە لە بنەڕەتی ووشەكە دایە وەك خۆی بە ئاشكرا (الاظهار) دەخوێندرێتەوە.

نموونە:

﴿سُلْطَٰنًا﴾ آل عمران: ١٥١، ﴿أَلْسِنَتِكُمْ﴾ الروم: ٢٢،

﴿وَأَلْوَٰنِكُمْ﴾ الروم: ٢٢، ﴿زِلْزَالًا﴾ الأحزاب: ١١،

﴿أَلْوَاحٍ﴾ القمر: ١٣، ﴿سَلْسَبِيلًا﴾ الإنسان: ١٨

### ٥- لامی فەرمان ( لام الامر ) :

بریتـی یـە لـە و لامـەی کـە لـە بنـەرەتی ووشـەکەدا نیـە بـەڵکو زیـادە ، دەچێتە سەر ( الفعل المضارع ) و سەرەتاو کۆتـایی کرداری رانەبردوو تا بیکات بە کرداری فەرمان.

نموونە:

﴿ وَلْيَكْتُبْ ﴾ البقرة: ٢٨٢ ، ﴿ وَلْيَعْفُواْ ﴾ النور: ٢٢ ،

﴿ فَلْيَمْدُدْ ﴾ الحج: ١٥ ، ﴿ ثُمَّ لْيَقْطَعْ ﴾ الحج: ١٥

## خشتەی لامی فەرمان

### ( لام الامر )

| بە مەرج دانراوە لە پێش ئەم ( لام )ـە دەبێت ( ثم ) یان ( واو ) یان ( فاء ) هاتبێت | |
|---|---|
| ثم + ل | ﴿ ثُمَّ لْيَقْطَعْ ﴾ |
| واو + ل | ﴿ وَلْيَعْفُواْ ﴾ |
| فاء + ل | ﴿ فَلْيَمْدُدْ ﴾ |

# خشتەی نـاوی دە قاریئەکان و راویەکـانیان[1]

| شار | قاریئەکان | ساڵی کۆچی دوایی | راویـەکان | ساڵی کۆچی دوایی |
|---|---|---|---|---|
| مەدینە | ١- نافع | ١٦٩ هـ | ١- قالون<br>٢- ورش | ٢٢٠ هـ<br>١٩٧ هـ |
| مەککە | ٢- ابن كثير | ١٢٠ هـ | ١- البزي<br>٢- قنبل | ٢٠٥ هـ<br>١٩١ هـ |
| بەسرە | ٣- ابو عمرو | ١٥٤ هـ | ١- الدوري<br>٢- السوسي | ٢٤٦ هـ<br>٢٦١ هـ |
| دیمەشق | ٤- ابن عامر | ١١٨ هـ | ١- هشام<br>٢- ابن ذكوان | ٢٤٥ هـ<br>٢٤٢ هـ |
| کوفە | ٥- عاصم | ١٢٧ هـ | ١- شعبة<br>٢- حفص | ١٩٣ هـ<br>١٨٠ هـ |
| کوفە | ٦- حمزة | ١٥٦ هـ | ١- خلف<br>٢- خلاد | ٢٢٩ هـ<br>٢٢٠ هـ |
| کوفە | ٧- الكسائي | ١٨٩ هـ | ١- ابوالحارث<br>٢- الدوري | ٢٤٠ هـ<br>٢٤٦ هـ |
| مەدینە | ٨-ابو جعفر | ١٣٠ هـ | ١- ابن وردان<br>٢- ابن جماز | ١٦٠ هـ<br>١٧٠ هـ |
| بەسرە | ٩- يعقوب | ٢٠٥ هـ | ١- رويس<br>٢- روح | ٢٣٨ هـ<br>٢٣٤ هـ |
| کوفە | ١٠- خلف | ٢٢٩ هـ | ١- إسحاق<br>٢- إدريس | ٢٨٦ هـ<br>٢٩٢ هـ |

( ١ ) بۆ زیاتر ناسینی دە قاریئەکان و راویەکانیان بڕوانە : ( المنير في احكام التجويد ) لاپەڕە : (٢٤٧ - ٢٥١). چاپی/١٨

## ئەو دوو پیتانـەی بە یەکتر دەگـەن ( الحرفان الملتقیان )

- هاوشێوە ( المتماثل )
- هاوڕەگەز (المتجانس )
- لێك نزیك (المتقارب)
- لێك دوور ( المتباعد )

**یەکەم /**

**تێکهەڵکێشانی پیتە هاو وێنەکان ( الادغام المتماثلین ): بریتی یە لە بەیەك گەیشتنی دوو پیتی هاو وێنە لە دەرچە ( مخرج ) و سیفەتدا، پیتی یەکەم ( ساکن ) بێت و دووەم یش بزواو ( متحرك ) بێت، بە شێوەیەك وەك یەك پیتی توندی شەددەداری لێ دێت لە جۆری پیتی دووەم کە پیتەکان بریتین لە : (تاء ، باء ، ذال ، دال ، کاف ، لام ، فاء ، واو ، میم ، هاء ، نون ، راء ، عین) ئەم جۆرە تێکهەڵکێشانە لە یەك ووشە و لە نێوان دوو ووشەش دا روو دەدات.**

# خشتەی تێکهەڵکێشانی هاو وێنەی بچووك

| پیتە هاو وێنەکان لە دەرچەو سیفەتدا | نموونەی تێکهەڵکێشانی بچووك | چۆنیەتی دەربڕین | جۆری تێکهەڵکێشان |
|---|---|---|---|
| بْ + بِ = بِّ | ﴿ٱضْرِب بِّعَصَاكَ﴾ البقرة: ٦٠ | اضرِبِّعَصَاكَ | تێکهەڵکێشانی تەواو |
| تْ + تِ = تِّ | ﴿رَبِحَت تِّجَٰرَتُهُمْ﴾ البقرة: ١٦ | رَبِحَتِّجَٰرَتُهُمْ | تێکهەڵکێشانی تەواو |
| ذْ + ذَ = ذَّ | ﴿إِذ ذَّهَبَ﴾ الأنبياء: ٨٧ | إِذَّهَبَ | تێکهەڵکێشانی تەواو |
| دْ + دَ = دَّ | ﴿وَقَد دَّخَلُواْ﴾ المائدة: ٦١ | وَقَدَّخَلُواْ | تێکهەڵکێشانی تەواو |
| كْ + كُ = كُّ | ﴿يُدْرِككُّمُ﴾ النساء: ٧٨ | يُدْرِكُّمُ | تێکهەڵکێشانی تەواو |
| لْ + لَ = لَّ | ﴿بَل لَّا يَخَافُونَ﴾ المدثر: ٥٣ | بَلَّا يَخَافُونَ | تێکهەڵکێشانی تەواو |
| فْ+فِ = فِّ | ﴿فَلَا يُسْرِف فِّي ٱلْقَتْلِ﴾ الإسراء: ٣٣ | فَلَايُسرِفِّي ٱلْقَتْلِ | تێکهەڵکێشانی تەواو |
| وْ + وَ = وَّ | ﴿عَفَواْ وَّقَالُواْ﴾ الأعراف: ٩٥ | عَفَوَّقَالُواْ | تێکهەڵکێشانی تەواو |
| مْ + مَ = مَّ | ﴿أَم مَّنْ أَسَّسَ﴾ التوبة: ١٠٩ | أَمَّنْ أَسَّسَ | تێکهەڵکێشان لەوپەڕی تەواوی دایە لە مینگە |
| هْ + هُ = هُّ | ﴿يُوَجِّههُّ لَا يَأْتِ﴾ النحل: ٧٦ | يُوَجِّهُّ لَا يَأْتِ | تێکهەڵکێشانی تەواو |
| نْ + نُ = نُّ | ﴿وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَآ﴾ الجن: ٢ | وَلَنُّشْرِكَ بِرَبِّنَا | تێکهەڵکێشان لەوپەڕی تەواوی دایە لە مینگە |
| رْ + رَ = رَّ | ﴿وَٱذْكُر رَّبَّكَ﴾ الكهف: ٢٤ | وَاذكُرَّبَّكَ | تێکهەڵکێشانی تەواو |
| عْ + عَ = عَّ | ﴿مَا لَمْ تَسْتَطِع عَّلَيْهِ﴾ الكهف: ٧٨ | تَستَطِعَّلَيْهِ | تێکهەڵکێشانی تەواو |

# چەند تێبینی یەك لە سەر تێکهەڵکێشانی هاو وێنە

١- لە ئایەتی : ﴿ مَآ أَغۡنَىٰ عَنِّي مَالِيَهۡۜ ٢٨ هَلَكَ عَنِّي سُلۡطَٰنِيَهۡ ﴾ الحاقة: ٢٨ – ٢٩

لە کاتی گەیاندنی ﴿ مَالِيَهۡۜ ← هَلَكَ ﴾ بە دوو جۆر دەخوێندرێتەوە ( السکت ، الادغام ).

❖ السکت : واتە بە ئاشکراکردنی پیتی ( هاء ) لە کاتی گەیاندنی ووشەی ﴿ مَالِيَهۡ ﴾ بە ﴿ هَلَكَ ﴾ بەم جۆرە دەخوێندرێتەوە :

﴿ مَآ أَغۡنَىٰ عَنِّي مَالِيَهۡۜ وەستان بەبێ دەنگ هَلَكَ عَنِّي سُلۡطَٰنِيَهۡ ﴾

خوێنەر بێ دەنگ دەبێت لە سەر پیتی ( هاء )ی ﴿ مَالِيَهۡ ﴾ چونکە هێمای ( س ) سەکتەی بۆ دانراوە بە شێوەیەك دەنگ دەپچڕێ بە بێ هەناسە.

❖ الادغام : تێك هەڵکێش کردنیان لە کاتی گەیاندن ﴿ مَالِيَهۡ هَلَكَ ﴾ بەم جۆرە دەخوێندرێتەوە: ﴿ مَآ أَغۡنَىٰ عَنِّي ماليَهَّلَكَ عَنِّي سُلۡطَٰنِيَهۡ ﴾ بەڵام خوێندنەوەی خاڵی یەکەم لە پێشترە لە جێ بە جێ کردن ( هو المُقدم في الأداء ).

٢- ئەوەی کە جیا دەکرێتەوە لە تێك هەڵکێشان کردنی پیتی ( واو ، یاء )ی هاو وێنە کە لە پێنج سیفەت وەك یەکن بەڵام جیاوازن لە شوێنی دەرچوونیان ، کە پیتی یەکەمیان ( واو ) یان ( یاء )ی درێژکردنەوە بێت ، وە پیتی دووەم ( واو ) یان ( یاء )ی لین بێت ، کە پێویستە هەردوو پیت ئاشکرا ( الاظهار ) بکرێت.

نموونە :

﴿ قَالُواْ وَأَقْبَلُواْ ﴾ یوسف: ٧١ ، ﴿ قَوْمِي يَعْلَمُونَ ﴾ یس: ٢٦

خشتەیەك بۆ لێك جیاکردنەوەی هەردوو پیتی ( واو ، یاء )

| نموونە لەپیتی (واو،یاء ) | نازناوی پیت | سیفەتی پیتەکان | | | | | | جیاکردنەوە یانبە شوێنی دەرچونیان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | |
| ﴿ ٱصْبِرُواْ وَصَابِرُواْ ﴾ | ( واو ) المدّ | الجهر | الرخاوة | الإستفال | الإنفتاح | الإصمات | الاخفاء | بۆشایی |
| | ( واو ) اللين | الجهر | الرخاوة | الإستفال | الإنفتاح | الإصمات | اللين | دوو لێوەکان |
| ﴿ فِي يُوسُفَ ﴾ | ( ياء ) المدّ | الجهر | الرخاوة | الإستفال | الإنفتاح | الإصمات | الاخفاء | بۆشایی |
| | ( ياء) اللين | الجهر | الرخاوة | الإستفال | الإنفتاح | الإصمات | اللين | ناوەراستی زمان |

٣- له تێك هەڵكێشانى هاووێنه دوو جۆر هەیه ( بچووك ، گەورە ) به چاكم زانى ئەو شوێنانەى كه تێك هەڵكێشانى گەورە له ریوایەتى (حفص) باس كراوه له نێو پەرتووكەكانى ( تجويد ) به كورتى ئاماژەى پێ بكەم لەم خشتەى خوارەوە(*):

## خشتەى تێكهەڵكێشانى هاو وێنەى گەورە

| نموونه | له بنەڕەتدا بەم شێوەیه بووه | جۆرى تێكهەڵكێشانه گەورەيه |
|---|---|---|
| ﴿ فَنِعِمَّا هِيَ ﴾ البقرة: ٢٧١ | ﴿ فَنِعِمَ مَا ﴾ | تێكهەڵكێشانى گەورە |
| ﴿ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓ ﴾ النساء: ٥٨ | ﴿ نِعِمَ مَا ﴾ | تێكهەڵكێشانى گەورە |
| ﴿ قَالَ أَتُحَٰٓجُّوٓنِّي ﴾ الأنعام: ٨٠ | ﴿ قَالَ أَتُحَاجُونَنِي ﴾ | تێكهەڵكێشانى گەورە |
| ﴿ لَا تَأۡمَ۬نَّا ﴾ يوسف: ١١ | ﴿ لَا تَأۡمَنُنَا ﴾(**) | له ریوایەتى ( حفص ) به (إشمام ، روم) دەخوێندرێتەوە. |
| ﴿ قَالَ مَا مَكَّنِّي ﴾ الكهف: ٩٥ | ﴿ قَالَ مَا مَكَّنَنِي ﴾(**) | تەنها (ابن كثير) بەم شێوەیه دەخوێنێتەوە |
| ﴿ تَأۡمُرُوٓنِّيٓ ﴾ الزمر: ٦٤ | ﴿ تَأۡمُرُونَنِي ﴾ | تێكهەڵكێشانى گەورە |

(*) بڕوانه ئەم سەرچاوانه بۆ زیاتر زانیارى لەسەر ئەم خشتەیه: ( احكام قراءة القران ) لاپەرە / ١٢٧ ، و ( المذكرة في التجويد) لاپەرە / ٦٢ ، و ( الواضح في أحكام التجويد ) لاپەرە / ٥٩ ، و ( التبيين في الاحكام تلاوة الكتاب المبين ) لاپەرە / ٢٥٦ ، و ( المختصر الوافي من هداية القاري الى التجويد كلام الباري ) لاپەرە / ١٩٢ ، و ( دليل الترتيل ) لاپەرە / ١٦٣ ، و ( الدقائق المحكمات في المخارج والصفات ) لاپەرە / ١٩٦، و (تيسير علم التجويد) لاپەرە / ٦٨، و (المنير في أحكام التجويد) لاپەرە / ١٦٢، و ( تيسير الرحمن في تجويد القران ) لاپەرە / ١٥٨ ، و ( جداول احكام التلاوة والتجويد ) لاثةرة / ٥١ .

( ** ) به پێى ئەم ڕوونكردنەوەیه ( حفص ) لەم ووشانه تەنها لەم دوو شوێنه ( الادغام الكبير )ى هەیه ( والله أعلم ) ، بۆ زانیارى زیاتر بڕوانه : ( فَوَائِدُ وَتَصْوِيبَاتٌ لِلمُجَازِينَ وَالمُجَازَات ) ، لاپەرە: ٥١ – ٥٣

## چەند روونکردنەوەیەك لەسەر تێك هەڵكێشانی گەورە ( الادغام الكبیر ):

١- بۆیە ناو دەبردرێت بە ( الادغام الكبیر ) ، لەبەر زۆر روودان و دووبارە بوونەوەی لە قورئانی پیرۆز، (لكثرةِ وقوعهِ) بە پێچەوانەی تێك هەڵكێشانی بچووك.

٢- تێك هەڵكێشانی گەورە ( الادغام الكبیر ) بەو تێك هەڵكێشانە دەوترێت كە لە نێوان دوو پیت روودەدات، بەڵام بە دوو مەرج :

- هەردوو پیت بزواو ( متحرك ) بن : نموونە : ﴿إِنَّهُۥ هُوَ﴾ الشعراء: ٢٢٠ ، ئەم جۆرە تێك هەڵكێشانە تایبەتە بە ریوایەتی ( السوسی ) لە ( ابو عمروا البصری )ـەوە.
- بە یەك گەیشتنی هەردوو پیت لە رووی نوسین ( خطاً ) وەك :

﴿أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾ الملك: ٢٦ نموونەی یەكەم هەردوو مەرجی تێدایە ( لفظاً ، خطاً)، بەڵام نموونەی دووەم تەنها یەك مەرجی تێدایە( متحرك )ـە، چونكە لە رووی نوسین ( الِف ) هاتووە ، لە نێوان هەردوو پیتی( نون )، كەواتە لە هیچ ریوایەتێك ئەم جۆرە تێك هەڵكێشان ناكرێت.

٣- لەو شوێنانەی قورئانی پیرۆز كە دوو پیتی هاووێنەی بزواو (متحرك) بە یەك دەگەن لە ریوایەتی (حفص ) پێویستە ( واجبە ) هەردوو پیت ئاشكرا بكرێت.

نموونە : ﴿أَوْ جَآءَ أَحَدٌ﴾ النساء:٤٣، ﴿إِنَّهُۥ هُوَ﴾ الشعراء: ٢٢٠,

﴿ٱلنِّكَاحَ حَتَّىٰ﴾ البقرة: ٢٣٥, ﴿أَبْرَحُ حَتَّىٰٓ﴾ الكهف: ٦٠،

تەنها لەم دوو شوێنە پیتی (حـ ) بەیەك دەگەن لە قورئانی پیرۆز .

٤- قورئان خوێنەکان ( **قاریئەکان** ) هەموویان هاودەنگن لەسەر ئەوەی کە پێویستە ( **واجب** )ە دوو پیتی هاووێنە یەکەم ( **ساکن** ) بێت دووەم بزواو( **متحرك** ) بێت، تێك هەڵکێش بکرێت.

## ٥- المتماثلان المطلق:

بریتی یە لە بە یەك گەیشتنی دوو پیتی هاووێنە کە یەکەم پیت بزواو (**متحرك**) بێت و دووەم ( **ساکن** ) بێت بە پێچەوانەی تێکهەڵکێشانی بچووك.

نموونه: ﴿ مَا نَنسَخْ ﴾ البقرة: ١٠٦ ، ﴿ حَـٰجَجْتُمْ ﴾آل عمران: ٦٦ ، ﴿ تَتْرَا ﴾ المؤمنون: ٤٤ ، ﴿وَحَفَفْنَـٰهُمَا﴾ الكهف: ٣٢

## تێبینی/

- بۆیە پێی دەوترێت تەواو - رەها - ( **المطلق** ) چونکە دەردەچێت لە پابەند بوون بە تێك هەڵکێشانی گەورە و بچووك.
- حوکمی خوێندنەوەی: پێویستە (**واجبە**) پیتەکان ئاشکرا (**الاظهار**) بکرێت، لە لای گشت ( **قاریئەکان** ).

## دووەم: تێک هەڵکێشانی هاوڕەگەز (الادغام المتجانسين) :

بریتی یە لە بە یەك گەیشتنی دوو پیتی هاوڕەگەز ، کە ( دەرچەیان یەکە و سیفەتیان جیایە ) پیتی یەکەم ( ساکن ) بێت ، دووەم بزواو ( متحرك ) بێت ، بە شێوەیەك وەك یەك پیتی توند و شەددەداری لێ دێت لە جۆری پیتی دووەم ، ئەمەش لە سێ شوێنی دەرچوونی پیتەکان ( مخرج ) روو دەدات کە بریتین لە( هەشت ) پیت کە ئەمانەن : ( طاء ، دال ، تاء , ظاء ، ذال ، ثاء , میم ، باء ).

١- لەشوێنی دەرچوونی پیتەکانی مەلاشووی سەرو(الحروف النطعية)

❖ تێك هەڵكێشانی پیتی ( تاء ) لە ( دال ) تەنها لە دوو شوێنی قورئانی پیرۆز روو دەدات.

نموونه :﴿ أَثْقَلَت دَّعَوَا ٱللَّهَ ﴾ الأعراف: ١٨٩،﴿ أُجِيبَت دَّعْوَتُكُمَا ﴾يونس: ٨٩

❖ تێك هەڵكێشانی پیتی ( دال ) لە ( تاء ) ئەم جۆرەیان زۆر دووبارە دەبێتەوە لە قورئانی پیرۆز.

نموونه: ﴿ قَد تَّبَيَّنَ ﴾البقرة:٢٥٦، ﴿ عَقَدتُّمُ ﴾المائدة:٨٩، ﴿ عَـٰهَدتُّمْ ﴾التوبة:٧،

﴿ إِن كِدتَّ ﴾ الصافات:٥٦، ﴿ وَمَهَّدتُّ ﴾المدثر:١٤

❖ تێك هەڵكێشانی پیتی ( تاء ) لە ( طاء ) ئەم جۆرەیان زۆر دووبارە دەبێتەوە لە قورئانی پیرۆز.

نموونه:﴿ وَدَّت طَّآئِفَةٌ ﴾آل عمران:٦٩،﴿ إِذْ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ ﴾آل عمران:١٢٢،

﴿ لَهَمَّت طَّآئِفَةٌ ﴾ النساء: ١١٣ ، ﴿ فَـَٔامَنَت طَّآئِفَةٌ ﴾ الصف: ١٤ ،

﴿ وَكَفَرَت طَّآئِفَةٌ ﴾الصف: ١٤ .

❖ تێك هەڵكێشانی پیتی ( طاء ) لە ( تاء ) ئەم جۆرەیان تەنها لە چوار شوێنی قورئانی پیرۆز هاتووە .

نموونە: ﴿ لَئِنۢ بَسَطتَ ﴾المائدة: ٢٨ ، ﴿ فَرَّطتُمۡ ﴾يوسف: ٨٠ ،

﴿ أَحَطتُ ﴾النمل: ٢٢، ﴿ فَرَّطتُ ﴾الزمر: ٥٦ .

**تێبینی:**

ئەم جۆرە تێك هەڵكێشانە بە ( الادغام ناقص ) ناو دەبردرێت لە لای گشت ( قاریئەكان )، چونكە پیتی (طاء) لە روانگەی سیفەتەكان هەموو سیفەتەكانی بەهێزن تەنها سیفەتی هەژان ( القلقلة ) نامێنێت ، بەڵام سیفەتی ( الإستعلاء ، الإطباق )ی دەمێنێ ، بۆیە پیتی ( طاء ) جێگەی نابێتەوە لە نێو پیتی ( تاء ).

## ٢-لە شوێنی دەرچوونی پیتەكانی نزیك پدوو (الحروف اللثية)

❖ تێك هەڵكێشانی پیتی ( ذال ) لە ( ظاء ) تەنها لە دوو شوێنی قورئانی پیرۆز روو دەدات.

نموونە: ﴿ إِذ ظَّلَمُوٓاْ ﴾النساء: ٦٤ ، ﴿ إِذ ظَّلَمۡتُمۡ ﴾الزخرف: ٣٩.

❖ تێك هەڵكێشانی پیتی ( ثاء ) لە ( ذال ) تەنها لە یەك شوێنی قورئانی پیرۆز هاتووە.

نموونە: ﴿ يَلۡهَث ذَّٰلِكَ ﴾الأعراف: ١٧٦.

## ٣-لە شوێنی دەرچوونی پیتەکانی دوو لێوەکان (الحروف الشفوية)

❖ تێك هەڵكێشانی پیتی ( باء ) لە ( میم ) تەنها لە یەك شوێنی قورئانی پیرۆز هاتووە.

نموونە : ﴿يَٰبُنَيَّ ٱرۡكَب مَّعَنَا﴾ هود: ٤٢.

### تێبینی/

❖ گشت ( قاریئەکان ) هاودەنگن لەسەر ئەوەی کە پێویستە ( واجبە ) دوو پیتی هاوڕەگەز تێك هەڵكێش بکرێن ، یەکەم ( ساکن ) بێت دووەم بزواو ( متحرك ) بێت.

## خشتەی تێك هەڵكێشانی پیتە هاوڕەگەزەکان

| پیتی هاوڕەگەز ( دەرچونیان لە یەك شوێن جیاواز لە سیفەت ) | نموونە | جۆری تێك هەڵكێشان |
|---|---|---|
| ت + د = دَّ | ﴿أَثۡقَلَت دَّعَوَا ٱللَّهَ﴾ | تێك هەڵكێشانی تەواو |
| د + ت = تَّ | ﴿قَد تَّبَيَّنَ﴾ | تێك هەڵكێشانی تەواو |
| ت + ط = طَّ | ﴿وَدَّت طَّآئِفَةٞ﴾ | تێك هەڵكێشانی تەواو |
| ط + ت = تَ | ﴿لَئِنۢ بَسَطتَ﴾ | تێك هەڵكێشانی ناتەواو |
| ذ + ظ = ظَّ | ﴿إِذ ظَّلَمُوٓاْ﴾ | تێك هەڵكێشانی تەواو |
| ث + ذ = ذَّ | ﴿يَلۡهَث ذَّٰلِكَ﴾ | تێك هەڵكێشانی تەواو |
| ب + م = مَّ | ﴿يَٰبُنَيَّ ٱرۡكَب مَّعَنَا﴾ | تێك هەڵكێشانی بە(مینگە) لەوپەڕی تەواوی دایە |

## سێیەم : تێك هەڵكێشانی لێك نزیك ( الادغام المتقاربین )

بریتی یە لە بەیەك گەیشتنی دوو پیت لە یەك نزیك ( لە دەرچە و سیفەتدا ) پیتی یەكەم ( ساكن ) بێت و پیتی دووەم بزواو ( متحرك ) بێت ، بە شێوەیەك وەك یەك پیتی توند و شەددەداری لێ دێت لە جۆری پیتی دووەم ، ئەمەش لە چەند شوێنی لەیەك نزیك لە دەرچە روو دەدات.

تێك هەڵكێشانی پیتی ( قاف ) لە ( كاف ).

نموونە: ﴿ نَخۡلُقكُّم ﴾ المرسلات: ٢٠

## تێبینی لەسەر تێك هەڵكێشانی پیتی ( قاف ) و ( كاف )

– سەبارەت بە ووشەی ﴿ نَخۡلُقكُّم ﴾ [1] المرسلات: ٢٠

دەتوانین لە ریوایەتی حەفص بە دوو شێواز بیخوێنینەوە:

- **تێك هەڵكێشانی ناتەواو ( إدغام ناقص ) :**

بریتیە لە تێك هەڵكێشانی پیتی ( قاف ) و ( كاف ) لەگەڵ مانەوەی سیفەتی بەرزی ( الاستعلاء ) لە پیتی ( قاف ) ، لەم حاڵەتەدا خوێنەر دەبێ پیتی ( قاف ) بە ( سكون ) و بە بەرزی ( الاستعلاء ) بخوێنێتەوە و هەژانی( القلقلة ) لەگەڵ دا نەبێ ، وەهەروها پیتی ( كاف ) بە سووكی دەخوێنیتەوە.

---

( ١ ) بروانە : ( التسهیل لقراءات التنزیل ) ، محمد فهد خاروف ، لاپەرە :٥٨١ .

**• تێکهەڵکێشانی تەواو ( إدغام محض ) :**

بریتی یە لەوەی کە زمان لە پاش ووتنی پیتی ( لام ) ڕاستەوخۆ بڕوات بۆ دەربڕینی پیتی ( کاف ) بەبێ ئەوەی هیچ شوێنەوارێکی قەڵەو کردنی پیتی ( قاف ) بە دەرکەوێ ، هەروەك چۆن ( کاف )ێکی شەددەدار بخوێنییەوە وە ئەم شێوازەیان بەهێزترە ( زانست رە )[1] ، و دەبێت خوێنەر رەچاوی شێوەی لێوەکانی بکات لە کاتی دەربڕینی پیتی ( لام ) و ( کاف ) لەبەر بوونی ( ضمة ) لە هەردوو پیت بۆ ئەوەی سیفەتی نزم بوو (الاستفال) لە پیتی ( کاف ) و( لام ) بەرز نەبێت و وەك خۆی دەرکەوێ لەکاتی خوێندنەوە، ئەمەش بەدەست نایەت تەنها بەوە نەبێ کە دەبێت گوێبیست و سەیری مامۆستای بەتوانا و باش بکەیت.

**ڕای گشت زانایان /** لە سەر مانەوەی سیفەتی ( الاطباق )ە لە پیتی ( طاء ) ، بەڵام ڕای جیایان هەیە لە سەر مانەوەی سیفەتی ( الإستعلاء ) لە پیتی ( قاف )، لە بەر ئەوەی سیفەتی ( الإطباق ) بەهێزترە لە (الإستعلاء)، بۆیە پێویستە پارێزگاری لە بەهێزترین سیفەت بکەین[٣].

❖ تێك هەڵکێشانی پیتی ( لام ) لە ( راء )، نموونە:

﴿ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيۡهِ ﴾ النساء: ١٥٨ ﴿ وَقُل رَّبِّ أَنزِلۡنِي مُنزَلٗا مُّبَارَكٗا ﴾ المؤمنون: ٢٩

❖ ( الـ )ی پێناساندن لەگەڵ سێزدە پیت تێك هەڵکێشانی لێك نزیکە جگە لە پیتی ( لام ) کە هاووێنەیە.

نموونەی لێك نزیك: ﴿ ٱلشَّمۡسُ ﴾ التكوير: ١

---

( ٢ ) بڕوانە : ( النشر ) : لاپەرە : ( ٣ – ٢٠ ).

( ٣ ) بڕوانە: احكام قراءة القران الكريم / لاپەرە: ١٣٣

❖ تێك هەڵكێشانی نونی (ساكن) و تەنوین لەگەڵ پێنج پیتە كان كە ئەمانەن : (یاء ، راء ، میم ، لام ، واو)

نموونە:﴿مِّن رَّبِّهِمْ﴾ البقرة: ٥ ، ﴿مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ﴾ البقرة: ١٢٠ ،

﴿مِّن لَّدُنْهُ﴾ الكهف: ٢ ،﴿مِّن مَّالِ﴾ النور: ٣٣ ،﴿مَن يَقُولُ﴾ العنكبوت: ١٠

روونكردنەوە/ قاریئەكان رایان جیاوازە لە سەر تێك هەڵكێشكردنی دوو پیتی لێك نزیك .

## خشتەی نموونەی پیتە لێك نزیكەكان ( لە دەرچەو سیفەتدا )

| پیتە لێك نزیكەكان ( لە دەرچەو سیفەتدا ) | نموونە | جۆری تێك هەڵكێشان |
|---|---|---|
| قْ + كُ = كُّ | ﴿نَخْلُقكُّم﴾ | تێك هەڵكێشانی ناتەواو لەگەڵ مانەوەی سیفەتی ( الاستعلاء ) + تێكهەڵكێشانی تەواو بە نەمانی پیت و سیفەت |
| لْ + رَ = رَّ | ﴿بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيْهِ﴾ | تێكهەڵكێشانی تەواو |
| ال + ١٣ پیت | ﴿ٱلشَّمْسُ﴾ | تێكهەڵكێشانی تەواو |
| نْ + رَ = رَّ | ﴿مِّن رَّبِّهِمْ﴾ | تێكهەڵكێشانی تەواو |
| نْ + وَ = وَ | ﴿مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ﴾ | تێكهەڵكێشانی ناتەواو ( چونكە سیفەتی نون دەمێنێ ) |
| نْ + لَ = لِّ | ﴿مِّن لَّدُنْهُ﴾ | تێكهەڵكێشانی تەواو |
| نْ + مَ = مَّ | ﴿مِّن مَّالِ﴾ | تێكهەڵكێشانی تەواو |
| نْ + يَ = يَ | ﴿مَن يَقُولُ﴾ | تێكهەڵكێشانی ناتەواو ( چونكە سیفەتی نون دەمێنێ ) |

## چوارەم/ بە یەك گەیشتنی دوو پیتی لە یەك دوور:

### ( حرفان المتباعدان )

بریتی یە لە بە یەك گەیشتنی دوو پیتی لەیەك دوور لە شوێنی دەرچوونیان و جیا لە هەندێك سیفەتدا ،

❖ پیتی ( نون ) لەگەڵ پیتی ( عین ) شوێنی دەرچوونیان زۆر لەیەك دوورە ، پیتی ( نون ) شوێنی دەرچوونی پێشەوەی زمانە بەڵام پیتی ( عین ) شوێنی دەرچوونی ناوەڕاستی ( قورگ )ـە.

نموونە:

﴿أَنْعَمْتَ﴾ الفاتحة: ٧ ، ﴿مَنْ عَمِلَ﴾ الأنعام: ٥٤

❖ پیتی ( میم ) لەگەڵ پیتی ( غین ) شوێنی دەرچوونیان زۆر لێك دوورە ، پیتی ( میم ) شوێنی دەرچوونی دوو لێوەکانە بەڵام پیتی (غین) شوێنی دەرچوونی ناوەڕاستی ( قورگ )ـە.

نموونە :

﴿فَإِنَّكُمْ غَـٰلِبُونَ﴾ المائدة: ٢٣

ئەم جۆرە حوکمەکەی بریتیە لە ئاشکراکردنی ( الاظهار ) پیتەکانی لە یەك دوور لە هەموو خوێندنەوەکاندا.

## روون كردنه‌وه /

له ریوایه‌تی ( حفص ) پیتی ( تاء التأنيث ) ئاشكرا ده‌كرێت له كاتی گه‌یشتنی به‌م شه‌ش پیتانه : ( سين ، ثاء ، صاد ، زاي ، ظاء ، جيم ) كه ئیمامی ( الشاطبي ) له سه‌ره‌تای ووشه كانی ئه‌م دێره هۆنراوه‌یه هێناویه‌تیه‌وه :

( وَأَبْدَتْ سَنَا ثَغرٍ صَفَتْ زُرْقُ ظَلْمِهِ جَمِعَنَ ........ )

| پیت | نموونه | جۆری خوێندنه‌وه |
|---|---|---|
| تْ + سَ | ﴿أَنۢبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ﴾ البقرة: ٢٦١ | له ریوایه‌تی ( حفص ) پیتی ( تاء ) ئاشكرا ده‌كرێت له‌كاتی گه‌یشتنی به پیتی ( سين ) |
| تْ + ثَ | ﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ﴾ الشمس: ١١ | له ریوایه‌تی ( حفص ) پیتی ( تاء ) ئاشكرا ده‌كرێت له‌كاتی گه‌یشتنی به پیتی ( ثاء ) |
| تْ + صَ | ﴿لَّهُدِّمَتْ صَوَامِعُ﴾ الحج: ٤٠ | له ریوایه‌تی ( حفص ) پیتی ( تاء ) ئاشكرا ده‌كرێت له‌كاتی گه‌یشتنی به پیتی ( صاد ) |
| تْ + زِ | ﴿خَبَتْ زِدْنَٰهُمْ﴾ الإسراء: ٩٧ | له ریوایه‌تی ( حفص ) پیتی ( تاء ) ئاشكرا ده‌كرێت له‌كاتی گه‌یشتنی به پیتی ( زای ) |
| تْ + ظَ | ﴿كَانَتْ ظَالِمَةً﴾ الأنبياء: ١١ | له ریوایه‌تی ( حفص ) پیتی ( تاء ) ئاشكرا ده‌كرێت له‌كاتی گه‌یشتنی به پیتی ( ظاء ) |
| تْ + جُ | ﴿نَضِجَتْ جُلُودُهُم﴾ النساء: ٥٦ | له ریوایه‌تی ( حفص ) پیتی ( تاء ) ئاشكرا ده‌كرێت له‌كاتی گه‌یشتنی به پیتی ( جيم ) |

## ڕوون کردنەوە /

لە ڕیوایەتی ( حفص ) پیتی ( دال ) لە ﴿ قَدۡ ﴾ طه: ٨٠ ئاشکرا دەکرێت لە کاتی گەیشتنی بەم هەشت پیتانە : ( سین ، ذال ، ضاد ، ظاء ، زاء ، جیم ، صاد ، شین ) کە ئیمامی ( شاطبي ) لە سەرەتای ووشە کانی ئەم دێرە هۆنراوەیە هێناویەتی:

(وَقَدْ سَحَبَتْ ذَيْلاً ضَفَا ظَلَّ زَرْنَبٌ    جَلَتْهُ صَبَاهُ شَائِقاً وَمُعَلِّلاَ)

| جۆری خوێندنەوە | نموونە | پیت |
|---|---|---|
| لە ڕیوایەتی ( حفص ) پیتی ( دال ) ئاشکرا دەکرێت لەکاتی گەیشتنی بە پیتی( سین ) | ﴿ قَدۡ سَمِعَ ٱللَّهُ ﴾ المجادلة: ١ | قَدۡ + سَ |
| لە ڕیوایەتی ( حفص ) پیتی ( دال ) ئاشکرا دەکرێت لە کاتی گەیشتنی بە پیتی( ذال ) | ﴿ وَلَقَدۡ ذَرَأۡنَا ﴾ الأعراف: ١٧٩ | قَدۡ + ذَ |
| لە ڕیوایەتی ( حفص ) پیتی ( دال ) ئاشکرا دەکرێت لە کاتی گەیشتنی بە پیتی( ضاد ) | ﴿ قَدۡ ضَلَلۡتُ إِذًا ﴾ الأنعام: ٥٦ | قَدۡ + ضَ |
| لە ڕیوایەتی ( حفص ) پیتی ( دال ) ئاشکرا دەکرێت لە کاتی گەیشتنی بە پیتی( ظاء ) | ﴿ لَقَدۡ ظَلَمَكَ ﴾ ص: ٢٤ | قَدۡ + ظَ |
| لە ڕیوایەتی ( حفص ) پیتی ( دال ) ئاشکرا دەکرێت لەکاتی گەیشتنی بە پیتی( زای ) | ﴿ وَلَقَدۡ زَيَّنَّا ﴾ الملك: ٥ | قَدۡ + زَ |

| | | |
|---|---|---|
| قَدْ + جَ | ﴿قَدْ جَعَلَ﴾ الطلاق: ٣ | لە ریوایەتی ( حفص ) پیتی ( دال ) ئاشکرا دەکرێت لەکاتی گەیشتنی بە پیتی( جیم) |
| قَدْ + صَ | ﴿لَقَدْ صَدَقَ﴾ الفتح: ٢٧ | لە ریوایەتی ( حفص ) پیتی ( دال ) ئاشکرا دەکرێت لەکاتی گەیشتنی بە پیتی( صاد ) |
| قَدْ + شَ | ﴿قَدْ شَغَفَهَا﴾ یوسف: ٣٠ | لە ریوایەتی ( حفص ) پیتی ( دال ) ئاشکرا دەکرێت لەکاتی گەیشتنی بە پیتی( شين ) |

## روون کردنەوە /

لە ریوایەتی (حفص ) پیتی ( ذال ) لە ﴿ إِذْ ﴾ ئاشکرا ( الاظهار ) دەکرێت، لە کاتی گەیشتنی بەم شەش پیتانە : ( تاء ، زاي ، صاد ، دال ، سین ، جیم ) کە ئیمامی ( شاطبي ) لە سەرەتایی ووشە کانی ئەم دێرە هۆنراوەیە هێناویەتی :

( نَعَمْ إِذْ تَـمَشَّتْ زَيْنَبٌ صَالَ دَلُّهَا سَمِيُّ جَمَالٍ واصلاً من تَوَصَّلاَ )

| پیت | نموونە | جۆری خوێندنەوە |
| --- | --- | --- |
| إِذْ + تَ | ﴿وَإِذْ تَخْلُقُ﴾ المائدة: ١١٠ | لە ریوایەتی ( حفص ) پیتی ( ذال ) ئاشکرا دەکرێت لەکاتی گەیشتنی بە پیتی( تاء ) |
| إِذْ + زَ | ﴿وَإِذْ زَيَّنَ﴾ الأنفال: ٤٨ | لە ریوایەتی ( حفص ) پیتی ( ذال ) ئاشکرا دەکرێت لەکاتی گەیشتنی بە پیتی( زای ) |
| إِذْ + صَ | ﴿وَإِذْ صَرَفْنَآ﴾ الأحقاف: ٢٩ | لە ریوایەتی ( حفص ) پیتی ( ذال ) ئاشکرا دەکرێت لەکاتی گەیشتنی بە پیتی( صاد ) |
| إِذْ + دَ | ﴿إِذْ دَخَلُواْ﴾ الذاريات: ٢٥ | لە ریوایەتی ( حفص ) پیتی ( ذال ) ئاشکرا دەکرێت لەکاتی گەیشتنی بە پیتی( دال) |
| إِذْ + سَ | ﴿إِذْ سَمِعْتُمُوهُ﴾ النور: ١٢ | لە ریوایەتی ( حفص ) پیتی ( ذال ) ئاشکرا دەکرێت لەکاتی گەیشتنی بە پیتی( سین ) |
| إِذْ + جَ | ﴿وَإِذْ جَعَلْنَا﴾ البقرة: ١٢٥ | لە ریوایەتی ( حفص ) پیتی ( ذال ) ئاشکرا دەکرێت لەکاتی گەیشتنی بە پیتی( جیم ) |

## روون کردنەوە /

لە ریوایەتی (حفص) چەند پیتێکی لە یەك نزیك لە شوێنی دەرچوونیان ئاشکرا دەکرێت ، پێویستە فێرخواز زۆر وریا بێت تێکهەڵکێشیان نەکات لە کاتی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز بەهۆی لەیەك نزیکیانەوە:—

| پیت | نموونە | جۆری خوێندنەوە |
|---|---|---|
| بْ + فَ | ﴿وَمَن لَّمۡ يَتُبۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ﴾ الحجرات: ١١ | لە ریوایەتی ( حفص ) پیتی ( باء ) ئاشکرا دەکرێت لەکاتی گەیشتنی بە پیتی( فاء ) |
| ثْ + تَ | ﴿لَبِثۡتَ﴾ البقرة: ٢٥٩ | لە ریوایەتی ( حفص ) پیتی ( ثاء ) ئاشکرا دەکرێت لەکاتی گەیشتنی بە پیتی( تاء ) |
| ضْ + طَ | ﴿أَضۡطَرُّهُۥٓ﴾ البقرة: ١٢٦ | لە ریوایەتی (حفص ) پیتی ( ضاد ) ئاشکرا دەکرێت لەکاتی گەیشتنی بە پیتی( طاء ) |
| فْ + بِ | ﴿نَخۡسِفۡ بِهِمُ﴾ سبأ: ٩ | لە ریوایەتی ( حفص ) پیتی ( فاء ) ئاشکرا دەکرێت لەکاتی گەیشتنی بە پیتی( باء ) |
| رْ + لِ | ﴿وَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ﴾ الطور: ٤٨ | لە ریوایەتی ( حفص ) پیتی ( راء ) ئاشکرا دەکرێت لەکاتی گەیشتنی بە پیتی( لام ) |
| ظْ + تَ | ﴿أَوَعَظۡتَ﴾ الشعراء: ١٣٦ | لە ریوایەتی ( حفص ) پیتی ( ظاء ) ئاشکرا دەکرێت لەکاتی گەیشتنی بە پیتی( تاء ) |
| دْ + ثَ | ﴿يُرِدۡ ثَوَابَ﴾ آل عمران: ١٤٥ | لە ریوایەتی ( حفص ) پیتی ( دال ) ئاشکرا دەکرێت لەکاتی گەیشتنی بە پیتی( ثاء ) |
| ضْ + تُ | ﴿أَفَضۡتُم﴾ البقرة: ١٩٨ | لە ریوایەتی (حفص ) پیتی ( ضاد ) ئاشکرا دەکرێت لەکاتی گەیشتنی بە پیتی( تاء ) |
| ذْ + تُ | ﴿أَتَّخَذۡتُمۡ﴾ البقرة: ٨٠ | لە ریوایەتی ( حفص ) پیتی ( ذال ) ئاشکرا دەکرێت لەکاتی گەیشتنی بە پیتی( تاء ) |

# حەوت ئەلفیەکان لە قورئاندا

## ( الألفات السبع في القران )




## حەوت ئەلیفەکان لە قورئاندا:

بریتی یە لە حەوت ( أَلِف ) لە حەوت ووشە لە قورئاندا ، لە ریوایەتی (حفص ) لە قیرائەتی ئیمام ( عاصم ) لە کاتی وەستان پیتی ( أَلِف ) جێگیر دەبێت ودەخوێندرێتەوە، بەڵام لە کاتی گەیاندن ( وصل ) و ڕۆیشتن پیتی ( أَلِف ) ناخوێندرێتەوە کە ئەمانەن:

١- ئەلیفی ووشەی ﴿ أَنَا ﴾(*) لە هەموو قورئاندا : بۆ ڕاناوی قسەکەربەکاردەهێنرێت ( ضمير المتكلم )

نموونە:

﴿إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ وَمَآ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾ الأحقاف: ٩

| نموونە | پیتی ( أَلِف ) لە کاتی وەستان دەخوێندرێتەوە | لە کاتی گەیاندن پیتی ( أَلِف ) ناخوێندرێتەوە |
|---|---|---|
| ﴿ أَنَا ﴾ | وَمَآ أَنَا۠ | وَمَآ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ |

(*) هەندێك لەم شوێنانەی کە لە قورئانی پیرۆز هاتووە : ( البقرة – ٢٥٨ ، الانعام – ١٦٣ ، الاعراف – ١٤٣-١٨٨ ، يوسف – ٤٥-٦٩ ، الكهف – ٣٤-٣٩ ، الشعراء – ١١٥ ، النمل – ٣٩-٤٠ ، غافر – ٤٢ ، الزخرف – ٨١ )

٢- ئەلیفی ووشەی ﴿ لَّٰكِنَّا۠ ﴾ تەنها لە یەك شوێن هاتووە لە قورئان.

نموونە:

﴿ لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّي وَلَآ أُشۡرِكُ بِرَبِّيٓ أَحَدٗا ﴾ الكهف: ٣٨

لە کاتی وەستان دەخوێندرێتەوە: لَّٰكِنَّا۠

لە کاتی گەیاندن ناخوێندرێتەوە: لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّي

٣- ئەلیفی ووشەی ﴿ ٱلظُّنُونَا۠ ﴾ تەنها لە یەك شوێن هاتووە لە قورئان:

نموونە:

﴿ وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ١٠ هُنَالِكَ ٱبۡتُلِيَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَزُلۡزِلُواْ زِلۡزَالٗا شَدِيدٗا ﴾ الأحزاب ١١،١٠

لە کاتی وەستان دەخوێندرێتەوە: ٱلظُّنُونَا۠

لەکاتی گەیاندن ناخوێندرێتەوە: ٱلظُّنُونَا۠ ١٠ هُنَالِكَ ٱبۡتُلِيَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَزُلۡزِلُواْ زِلۡزَالٗا شَدِيدٗا

٤- ئەلیفی ووشەی ﴿ٱلرَّسُولَا۠﴾ تەنها لە یەك شوێن هاتووە لە قورئان.

نموونە:

﴿أَطَعۡنَا ٱللَّهَ وَأَطَعۡنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴿٦٦﴾ وَقَالُواْ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعۡنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠﴾

الأحزاب: ٦٦ - ٦٧

لە کاتی وەستان دەخوێندرێتەوە

ٱلرَّسُولَا۠

لە کاتی گەیاندن ناخوێندرێتەوە

وَأَطَعۡنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴿٦٦﴾ وَقَالُواْ رَبَّنَآ إِنَّآ

أَطَعۡنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠

٥- ئەلیفی ووشەی ﴿ٱلسَّبِيلَا۠﴾ تەنها لەیەك شوێن هاتووە لە قورئان.

نموونە:

﴿وَقَالُواْ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعۡنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴿٦٧﴾ رَبَّنَآ ءَاتِهِمۡ ضِعۡفَيۡنِ
مِنَ ٱلۡعَذَابِ وَٱلۡعَنۡهُمۡ لَعۡنٗا كَبِيرٗا﴾ الأحزاب: ٦٧ - ٦٨

لە کاتی وەستان دەخوێندرێتەوە

ٱلسَّبِيلَا۠

لە کاتی گەیاندن ناخوێندرێتەوە

فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴿٦٧﴾ رَبَّنَآ ءَاتِهِمۡ ضِعۡفَيۡنِ

مِنَ ٱلۡعَذَابِ وَٱلۡعَنۡهُمۡ لَعۡنٗا كَبِيرٗا

٦- ئەلیفی ووشەی ﴿ قَوَارِيرَاْ ﴾ ی یەکەم لە سورەتی ( **الإنسان** ): بەڵام لە ﴿ قَوَارِيرَاْ ﴾ ی دووەم لە ئایەتی (١٦)ی هەمان سورەت لە سەری بوەستی یان بگەیەنی ( أَلِف )ەکە ناخوێندرێتەوە ، واتە لە وەستان و گەیاندن تەنها بە ( راء ) دەخوێندرێتەوە.

## روون کردنەوە/

| نموونە | پیتی ( أَلِف ) لە کاتی وەستان دەخوێندرێتەوە | پیتی( أَلِف ) لە کاتی گەیاندن ناخوێندرێتەوە |
|---|---|---|
| ﴿ قَوَارِيرَاْ ﴾ی یەکەم | ﴿ كَانَتْ قَوَارِيرَاْ ﴾ | ﴿ كَانَتْ قَوَارِيرَاْ ﴿١٥﴾ قَوَارِيرَاْ مِن فِضَّةٍ قَدَّرُوهَا تَقْدِيرًا ﴾ |
| ﴿ قَوَارِيرَاْ ﴾ی دووەم | لە کاتی وەستان ناخوێندرێتەوە ( أَلِف )ی ﴿ قَوَارِيرَاْ ﴾ | لە کاتی گەیاندن ناخوێندرێتەوە (أَلِف) ﴿ قَوَارِيرَاْ مِن فِضَّةٍ قَدَّرُوهَا تَقْدِيرًا ﴾ |

٧- ئەلیفی ووشەی ﴿ سَلْسَبِيلًا ﴾ تەنها لە یەك شوێنی قورئان هاتووە ، بە دوو جۆر دەخوێندرێتەوە لە کاتی وەستان ، بەڵام جگە لە ( أَلِف ) ئەگەر سەیری هەر پیتێك بکەین لە قورئانی پیرۆز ئەم جۆرە هێمایەی لەسەر بێت ( ٥ ) ئەو پیتە ناخوێندرێتەوە نموونە : ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ﴾البقرة: ٥، ﴿ وَمَلَإِيْهِمْ ﴾یونس: ٨٣ ﴿ وَثَمُودَاْ ﴾ النجم: ٥١ ﴿ قَوَارِيرَاْ ﴾ الإنسان: ١٦

## تێبینی لەسەر حەوت ئەلیفەکان لە قورئاندا :-

١. هێمای ( سکون )ی لەسەر ( أَلِف )ەکان لە شێوەی ( زیرۆ – 0 )ی ئینگلیزیە تەنها لە ووشەی ﴿سَلَسِبِلَا﴾ نەبێت لە شێوەی پێنج ( ٥ )ی کوردیە کە تاکە شوێنە لە کاتی وەستان قورئان خوێن بۆی هەیە بە دوو جۆر بیخوێنێتەوە:

❖ بەبێ ( أَلِف ) ووشەی ﴿سَلَسِبِلَا﴾ بخوێندرێت کە ئەم جۆرە لە پێشترە لە جێ بە جێ کردندا لە کاتی وەستان : ( سَلْسَبِيلْ )

❖ بە ( أَلِف ) ووشەی ﴿سَلَسِبِلَا﴾ بخوێندرێت لە کاتی وەستان : ( سَلْسَبِيلا )

٢. ئەلیفی ﴿وَثَمُودَاْ﴾ لە سورەتەکانی هود : ٦٨ ، الفرقان : ٣٨ ، العنكبوت : ٣٨ ، النجم : ٥١ لە کاتی وەستان و ڕۆیشتن لە سەری ناخوێندرێتەوە ، کە ئاماژەمان بە جۆری هێماکە کرد لە خاڵی یەکەم ، بەڵام لە ڕیوایەتی ( شعبة ) لە کاتی گەیاندنی پیتی ( دال ) بە تەنوینی ( فتحة ) دەخوێندرێتەوە ، جگە لە سورەتی ( النجم – ٥١ ) وەك ( حفص )ە لە خوێندنەوە ، واتە سێ شوێنەکەی تر بە ﴿ثَمُودَاْ﴾ دەخوێندرێتەوە بە (مـدّ)ی ( عوض ) واتە پیتی ( أَلِف ) جێگیر دەبێت لە خوێندنەوەدا لە کاتی وەستان.

# باسی درێژکردنەوەکان

## ( الـمُدُود )

❖ پێناسەی درێژکردنەوە ، ( تعريف المدّ )

١- درێژکردنەوەی بنەرەتی( بنچینەیی + درێژکردنەوەی ئاسایی ( سروشتی ) ، ( مَدُّ الأصلي + مَدُّ الطبيعي ).

٢- درێژکردنەوەی گۆڕاو ( لە جێدانان ، لە جیاتی ) ، ( مَدُّ البَدَلْ ).

٣- درێژکردنەوەی لە بڕی ( قەرەبوو ) ، ( مَدُّ العِوَضِ ).

٤- درێژکردنەوەی گەیاندنی بچووك ، ( مَدُّ الصغرى ).

٥- درێژکردنەوەی جێگیر ، ( مَدُّ التمكين ).

٦- درێژکردنەوە لە پیتی پچڕاوی ئاسایی، ( مَدُّ الطبيعى فِي الحرُوف المقطعة ).

٧- بە یەك گەیشتنی دوو پیتی (ساکن) لە نێوان دوو ووشە لە قورئانی پیرۆزدا، (التقاء الحرفين الساكنين فِي القران الكريم).

٨- درێژکردنەوەی بەیەك گەیشتوو ، پێکەوەلکاو ، ( مَدُّ المتصِل ).

٩- درێژکردنەوەی ڕێپێدراوی جودا ، جیاکراو، (المَدُّ جائِزْ المُنْفَصِل).

١٠- درێژکردنەوەی گەیاندنی گەورە ، (المَدُّ صِلَةَ الكُبْرى ).

١١- درێژکردنەوەی پێویست بە هەموو جۆرەکانی یەوە ، ( المَدّ اللازم بِأَنواعِهِ ).

١٢- درێژکردنەوە بەهۆی ( سكون )ی تووشهاتوو ، لەناکاو، ( المَدُّ العَارض للسكُون ).

١٣- درێژکردنەوەی ناسك ، نەرم ، ئاسان ، ( المَدُّ اللّين ).

١٤- بەراوردێك لە نێوان جۆرەکانی درێژکردنەوەی لقی- لاوەکی ، نائاسایی ، ( مُقَارَنَةٌ بَيْنَ أَنْوَاعِ المُدُود الفَرْعِيَّة ).

١٥- بنچینەی بەهێزترین هۆکارەکانی درێژکردنەوە ، ( قَاعِدةُ أَقْوى السَبَبَينِ ).

# حوكمەكانی درێژكردنەوە و جۆرەكان

## (أحكام المَدود وأنواعه )

**پێناسەی ( مَـدّ ) درێژكردنەوە :-**

**لـە زمانەوانیـدا** : زیـادكردن ، درێژكردنـەوە، ( الزِّيـادَة )[1] خـوای گـەورە دەفــەرموێ : ﴿ وَيُمۡدِدۡكُم بِأَمۡوَٰلٖ وَبَنِينَ ﴾ نـوح: ١٢ واتــە: پــەروەردگار مــاڵ وسامان و منداڵتان بۆ زیاد دەكات.

**لە زاراوەدا** : بریتـی یـە لـە درێژكردنـەوەی دەنـگ بـە پیتێـك لـە پیتـەكانی (المَدّ ) یان ( اللين )[2]

## درێژكردنەوە ( المَدّ ) دەبێت بە دوو بەش

| ( أصلي ) بنەرەتی – بنچینەیی | ( فرعي ) لقی – لاوەكی ، نائاسایی |
| --- | --- |
| ( أصلي ) بنەرەتی – بنچینەیی ، لە بنەرەتدا ( عَرَبْ ) لە گفتوگۆ پیتەكانی درێژكردنەوەیان بە ئەندازەی دوو حەرەكە دەربڕیوە. ( ءَ ا ، ءُ و ، ءِ ي ) | ( فرعي ) لقی – لاوەكی ، نائاسایی بە هۆكاری ( همزة )( ٥،٤ ) و ( سكون )( ٦،٤،٢ ) دەبێتە درێژكردنەوەی نائاسایی. |

---

( ١ ) المَدُّ لغةً : الزِّيادةُ.  واصْطِلاحاً: إطالَةُ الصَّوتِ بحُرُفِ المَدِّ أوللين.

( ٢ ) پیتەكانی ( مَدّ ) ئەگەر هۆكاری درێژكردنەوەی هەبوو، واتە: هەمزە یان (سكون)ی لە دوا هات بوو ئەوە دەبێتە هۆی درێژكردنەوەی دەنگ، بەڵام لە پیتەكانی ( اللين ) تەنها وەستان بە ( سكون ) لە كۆتایی ووشە دەبێتە هۆی درێژكردنەوەی دەنگ، نموونە: ( قَوْم، خَوْف ، قُرَيْش ، البَيْت ).

## یەکەم/ درێژکردنەوەی ئاسایی – سروشتی ، ( المدُّ الطبيعی )

بریتی یە لە درێژکردنەوەی پیتەکانی (مَدّ):
بە مەرجێك پیتەکان خۆیان (ساکن) بن وە لەرەگەزی خۆیان لە پێشیانەوە هاتبێت، وەك: ﴿نُوحِيهَآ﴾ هود: ٤٩ ، کە هەرسیّ جۆری تێدایە لە درێژکردنەوەی ئاسایی،جا روو دانەکەش لەسەر هیچ هۆکارێك و پەیوەستێك نەوەستاوە .

ئەمەش لە کاتی گەیاندن و وەستان هەر بە ئەندازەی دوو ( حَرَكَة ) جووڵە درێژدەکرێتەوە.

نموونە : ﴿ قَالَ يَـٰمُوسَىٰٓ ﴾ الأعراف: ١٤٤

پێوەری ماوەی درێژکردنەوەی ئاسایی ( مَدُّ الطبيعی ) : زۆربەی خڵك پەنجە دەکەنە پێوەر بۆ درێژکردنەوە بە ئەندازەی ( نوقاندن یان کردنەوەی پەنجە ) ، ئەم جۆرە پێوەرە زۆر روون نیە ، زانایانی پێشتر بە ئەندازەی دوو ( حَرَكَة ) وەك ( قَقَ ) بە ئەندازەی یەك ( ألِف ) یان بۆ درێژکردنەوە ی ئاسایی داناوە ، بەڵام فێرخواز لەگەڵ ماوٚستاکەی دەبێتە زانستی هەست و دەرك پێکردن لە کاتی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز.

## تێبینی/ لەسەر درێژکردنەوەی ئاسایی ( المدُّ الطبيعي )

- دروست نیە ( المَدّ الطبيعي ) لە ئەندازەی دوو ( حَرَكَة ) کەمتر یان زیاتر بێت زۆربەی خەڵك بە تەواوی مافی ( مَدّ الطبيعي ) نادات بە تایبەتی لە دەربڕینی ( ما )ی ( النافية ) و ( واو الجماعة ).

نموونە: ﴿ قَالُوا۟ وَأَقْبَلُوا۟ عَلَيْهِم مَّاذَا تَفْقِدُونَ ﴾ يوسف: ٧١

- هەندێك لە خەڵك بە یەك ئاست ( المَدّ الطبيعي ) ناخوێنیٚ بە تایبەتی لە سورەتی ( الفاتحة ) .

نموونە: ﴿ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴾ الفاتحة: ٢

درێژکردنەوەی ( اَلِفِ )ی ( عـا ) بە هۆی بایەخدان بە ئاوازی نەشاز ، لە ئەندازەی دوو ( حَرَكَة ) زیاتر دەردەبڕێت ، وە هەروەها خوێندنەوەی: ﴿ ٱلصِّرَٰطَ ﴾ الفاتحة: ٦ ، لە ئاستی خۆی زیاتر درێژ دەکاتەوە ( اَلِف )ی ( رَا ) کە پێویستە فێرخواز وریا بێت ( مَدّ الطبيعي ) لەکاتی دەربڕین لە یەك ئاست بخوێنێت.

## دووەم/ درێژكردنەوەی گۆڕاو ، لە جیاتی ، لە جێدانان. ( مَدُّ البَدَلِ )[1]

بریتی یە لە درێژكردنەوەی ( ا – و – ی ) لە جیاتی ( همزة ) واتە: ئەم ووشانەی كە لە بنچینەدا لە دوو (همزة) پێك هاتووە ( همزة )ی یەكەم ( حَرَكَة ) جووڵەدارە ، وە ( همزة )ی دووەم ( ساكن )ە لە بنچینەدا،

بەم شێوەییە ( أَأْ دَم ) لە دەربڕین دەبێت بە ﴿ءَادَمَ﴾ البقرة: ٣١ ،

نموونە : ( أُأْ تــواْ ) لە دەربڕین دەبێت بە ﴿أُوتُوٓاْ﴾ آل عمران: ٢٣ ،

نموونە: ( إِأْ یمان ) لە دەربڕین دەبێت بە ﴿إِيمَٰنًا﴾ التوبة: ١٢٤،

واتە: هەمزەی دووەم گۆڕانكاری بەسەر دێ جووڵەو ڕەگەزی پێش خۆی وەردەگرێت لە كاتی وەستان و ڕۆیشتن بە ئەندازەی دوو جووڵە درێژدەكرێتەوە.

**تێبینی/** چەند ووشەیەك هاتووە لە قورئانی پیرۆز كەبە (مَدُّ البَدَلِ) دەچن بە (شبيه بالبدل) ناسراون كە پیتە درێژكردنەوەكان لە بنەڕەتدا ( همزة )ی (ساكن) نەبوینە.

نموونە:

﴿قُرْءَانَ﴾ الإسراء: ٧٨ ، ﴿مَسْـُٔولًا﴾ الإسراء: ٣٤، ﴿إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ الصف: ٦.

---

(١) هەندێك لە زانایان ( مَدُّ البَدَلِ ) بە جۆری ( فرعي ) لاوەكی دادەنێن ، چونكە لە پێش پیتەكانی ( مَدّ ) هەمزە هاتوە لە بەر بوونی هەندێك لە قاریئەكان ( القراء ) وەك: ( وَرْش ) كە ( مَدُّ البَدَلِ ) درێژدەكاتەوە بە ئەندازەی ( ٢ – ٤ – ٦ ) جووڵە ، بەڵام هێناو مانە لەگەڵ مەددی ئاسایی بۆ ئەوەیە تا فێرخواز بە ئاسانی بزانێت دوو جووڵە درێژدەكرێتەوە لە ریوایەتی ( حفص ).

## سێیەم/ درێژکردنەوەی ، لە بڕی ، قەرەبوو. ( مَدُّ العِوَض ).

بریتی یە لە درێژکردنەوەی ( ألِف ) لە کاتی وەستان لە سەر کۆتایی ووشە بە مەرجێك پیتی کۆتایی ووشەکە تەنوین ( منصوب ) بێت ، واتە: لە بڕی تەنوینی ( فتحة ) بە ئەلیفێك دەخوێندرێتەوە لە کاتی وەستان ، بەڵام لە کاتی ڕۆیشتن لە سەر تەنوینەکە ئەوە ( مَدّ عِوَض ) دروست نابێت ، بۆیە ناودەبرێت بە ( عِوَض ) ، چونکە لە بڕی تەنوین ( ألِف ) دادەنرێت و دەخوێندرێتەوە.

ماوەی درێژکردنەوەی ( مَدّ عِوَض ) بە ئەندازەی دوو جوڵە درێژدەکرێتەوە ، دروست نابێت تەنها لە کاتی وەستان نەبێت ، وەك ئەم خشتەیەی خوارەوە زیاتر روون کراوەتەوە:-

| نموونە | لە کاتی وەستان دەبێت بە(عِوَض) | لە کاتی ڕۆیشتن دەبێت بە تێك هەڵکێشان |
|---|---|---|
| ﴿ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ﴾ البقرة: ٢ | ﴿ هدًا ﴾ | ﴿ هدىَ لّلمتقين ﴾ |
| ﴿ وَنِسَآءً وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ﴾ النساء: ١ | ﴿ وَنساءَا ﴾ | ﴿ وَنساءَ وتقوا الله ﴾ |
| ﴿ مُّسَمًّى يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ ﴾ الرعد: ٢ | ﴿ مسمَّا ﴾ | ﴿ مسمَّ يُدَبِرُ الأمر ﴾ |
| ﴿ وِرْدًا ۝٨٦ لَّا يَمْلِكُونَ ﴾ مريم: ٨٦ - ٨٧ | ﴿ وِردَا ﴾ | ﴿ وِردَا لّا يملكون ﴾ |

## تێبینی لەسەر درێژدەکەنەوەی لە بڕی ( مَدّ عوض )

❖ زۆرێك لە خەڵك ( مَدّ عوض ) زیاتر لە دوو جووڵە درێژدەکەنەوە بە تایبەتی لە کاتی تەواوبوونی خوێندنی قورئان لەناو نوێژادا بۆ نمونە کاتێ لە سەر ووتەی خوای گەورە ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا ﴾ ، ﴿ وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ﴾ دەوەستن ، یان ئەو قورئان خوێنانەی بایەخ بە خوێندنەوەی نەشاز دەدەن ( غیر جائز ) کە ڕێگەپێنەدراوە وەك لە بۆنەکان دەیان بیستی چۆن لە حوکمەکانی ( تجوید ) لا دەدەن ، خوا پەنامان بدات.

❖ کاتێك ( هاء )ی مێینە ( تأنیث ) تەنوینی ( فتحة ) ی لەسەر بێت و لەسەری بوە ستی ئەوا ( ألِف ) شوێنی ناگرێتەوە بەڵکو بە پیتی ( هاء ) ی ( ساکن ) دەخوێندرێتەوە .

بۆ نموونە:

﴿ وَشَجَرَةً ﴾ المؤمنون: ٢٠ ← لە کاتی وەستان لەسەری ← ﴿ وَشَجَرَةْ ﴾

﴿ جَنَّةً ﴾ الإنسان: ١٢ ← لە کاتی وەستان لەسەری ← ﴿ جَنَّهْ ﴾

﴿ رَحْمَةً ﴾ الكهف: ٦٥ ← لە کاتی وەستان لەسەری ← ﴿ رَحْمَهْ ﴾

﴿ نِعْمَةً ﴾ القمر: ٣٥ ← لە کاتی وەستان لەسەری ← ﴿ نِعْمَهْ ﴾

❖ هەندێك لە فێرخوازان لە كاتی دەوركردنەوەی قورئانی پیرۆز پەلە بە زمان دەكەن لە كاتی وەستان لە سەر ئەم ووشانە :-

نموونە:

﴿ رَضِيًّا ﴾ مريم: ٦ ، ﴿ وَعَشِيًّا ﴾ مريم: ١١

بە هەمزە دەردەبڕن لە كۆتایی ووشەكان : ( رَضياءَ ، عَشياءَ ) ئەم جۆرە خوێندنەوەش هەڵەیە ، چونكە ئاماژەمان بە دەنگی پیتەكانی ( مَـدّ ) كرد كە لە بۆشایی ( قورگ و دەمەوە ) دەردەچێت ، و شوێنی دیاریكراویان نیە.

﴿ رَضِيًّا ﴾ مريم: ٦ ← خوێندنەوەی هەڵە ← ﴿ رَضِياءَ ﴾

﴿ وَعَشِيًّا ﴾ مريم: ١١ ← خوێندنەوەی هەڵە ← ﴿ وَعَشياءَ ﴾

## چوارەم/ درێژکردنەوەی گەیاندن ( المَدّ الصلة )

ئەم جۆرە ( مَـدّ )ـە دەبێت بە دوو بەش

| گەیاندنی بچووك ( الصلة الصغرى ) | گەیاندنی گەورە ( الصلة الكبرى ) |
| --- | --- |

### گەیاندنی بچووك:-

بریتیە لە هاتنی ( هاء )ی ڕاناو ( ضمیر ) كە بۆ تاكی نێری نادیار بەكاردێت ، جا لە ڕووی پێوەر (قیاس)ـەوە مەرجە ئەم ( هاء )ـە (ضمة) یان ( فتحة ) بێت، وە بكەوێتە نێوان دوو پیتی جووڵاو، واتە : پیتی پێش و دوای خۆی ( سكون ) نەبن و ( همزة )ـی ( قطع )ـی بەدوا دانەهاتبێت ، بەڵام ئەگەر ( همزة القطع )ـی بە دوادا هاتبێت ئەو كات دەبێتە گەیاندنی گەورە ( صلة كبرى ).

نموونە ی گەیاندنی بچووك :

نموونە : ﴿كِتَٰبَهُۥ وَرَآءَ ظَهۡرِهِۦ﴾الانشقاق: ١٠، لە كاتی گەیاندن دەبێت بە ( مَدّ ) بەڵام لە كاتی وەستان لەسەر (هاء) بە (سكون) دەخوێندرێتەوە، وەك ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِعِبَادِهِۦ لَخَبِيرُۢ بَصِيرٞ﴾ فاطر: ٣١، ئەم جۆرە مەددە لە ریزی درێژكردنەوەی ئاسایی ( مَدُّ الطبیعي ) دادەنرێت.

بەڵام ، گەیاندنی گەورە ( مَدّ صلة الكبرى )

نموونە : ﴿مَالَهُۥٓ أَخۡلَدَهُۥ﴾ الهمزة: ٣، ئەم جۆرە مەددە لە ریزی درێژكردنەوەی نائاسایی(مَدّ فرعي ) دادەنرێت بە هۆی هەمزەوە درێژدەكرێتەوە كە لە شوێنی خۆی دا باسی دەكەین بە پشتیوانی خوا.

## ئاگاداری :

لەم نموونانەی خوارەوە لەگەڵ هاو وێنەکانیان نابن بە ( مَدُّ صِلَة ) لەبەر نەبوونی مەرج بۆ درێژکردنەوەی گەیاندنی بچووک ( الصلة الصغرى ).

نموونەکان :-

﴿يَعْلَمْهُ اللَّهُ﴾ آل عمران: ٢٩ ، ﴿مِنْهُ اسْمُهُ﴾ آل عمران: ٤٥ ، ﴿فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾ آل عمران: ٥٥

لەبەر ئەوەی پیتی ( هاء ) پێش و پاشی ( ساكن )ە.

لەبەر ئەوەی پیتی ( هاء ) پێش و پاشی ( ساكن )ە

لەبەر ئەوەی پیتی پێش ( هاء ساكن )ە.

﴿أَرْجِهْ وَأَخَاهُ﴾ الأعراف: ١١١ ، الشعراء: ٣٦ ، ﴿فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ﴾ النمل: ٢٨

چونکە لە بنەڕەتدا ( هاء )ی ڕاناو ( ضمير ) ( ساكن )ە

❖ جیادەکرێتەوە لە بناغەی درێژکردنەوەی گەیاندنی بچووک لە دوو جێگە لە قورئانی پیرۆز.

١- نموونەی یەکەم / ﴿وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَانًا﴾ الفرقان: ٦٩

هەرچەند مەرجی بناغەی لەسەر جێ بە جێ نابێت، چونکە پیتی پێش ( هاء ) ساکنە، بەڵام هەر دوو جووڵە ( حركة ) درێژ دەکرێتەوە چونکە بەم شێوە یەوەرگیراوە لە پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ واتە: (السماعي) یە. لەم جۆرە بابەتانەش ڕیوایەت و بیستن وەردەگیرێت نەك یاسا گشتی یەکان ، لە ڕیوایەتی ( حفص ) تەنها لەم شوێنە وەك قیرائەی (ابن كثير المكي) دەخوێندرێتەوە.

ب- نموونەی دووەم / ﴿ يَرۡضَهُ لَكُمۡ ﴾الزمر: ٧

هەرچەندە لەم شوێنە پیتی ( هاء ) پێش ود وای خۆی جووڵەدارە بە گوێرەی یاساکە بێتدەبێ درێژبکرێتەوە ، بەڵام بەبیستن و ریوایەت وەردەگیرێت و درێژناکرێتەوە، لەوێنە(رسم)ی قورئانی پیرۆز ئەم جۆرە تێبینیە ئاشکرایە لە نوسین نەنوسراوە بە ( واو )ی بچووك ، چونکە لە بنچینەدا ئەم ووشەیە: ﴿ يَرۡضَاه ﴾ بووە، لە پێش (جزم)ەوە[1] هاتووە.

❖ پێویستە لەسەر قورئان خوێن پیتی ( هاء ) لە خوارەوەی ( قورگ ) دەربهێنێت بە تەواوی ( صافي ) دوور لە تێکەڵکردن بە مینگە ( غنة ) بە چاکی دوو لێوەکان بۆ پێشەوە بێنێت لە ( هاء )ی ( مضموم ) بۆ ئەوەی درێژکردنەوەکە دروست بێت.

## پێنجەم/ درێژکردنەوەی جێگیر ( مَدُّ التمكين )[2]

بریتیە لە بەیەکگەیشتنی دوو پیتی ( یاء ) یەکەمیان شەددەدار بێت و دووەمیان ( ساکن ) بێت.

وەك: ﴿ حُيِّيتُم ﴾النساء: ٨٦ ، ﴿ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ﴾مريم: ٥٨ ، ﴿ ٱلۡحَوَارِيِّـۧنَ ﴾المائدة: ١١١ ، ﴿ عِلِّيِّينَ ﴾ المطففين: ١٨ بۆیە ناودەبرێت بە درێژکردنەوەی جێگیر ( مَدُّ التمكين ) ، چونکە بە شێوەیەك پیتی ( یاء ) دەردەچێت کە جێگەی خۆی دەکاتەوە لە شوێنی دەرچوونی بەهۆی شەددەکەیەوە.

---

[1] ) بڕوانە : دليل الترتيل ، لاپەرە/ ١٨٤ لەگەڵ : علم التجويد – الغوثاني ، المستوى الثاني ، لاپەرە : ٥٠ – ٥١.

[2] ) لە چەند سەرچاوەیەك ( مَدّ التمكين ) بە شێوازێکی تریش ئاماژەیان پێکردووە : کە پیتی یەکەمیان ( واو ) یان ( یاء )ی درێژکردنەوە بێت ، وە پیتی دووەم ( واو ) یان ( یاء )ی لین بێت.کە پێویستە هەردوو پیت ئاشکرا ( الاظهار ) بکرێت و بە ئەندازەی دوو جووڵە درێژبکرێنەوە.

نموونە: ﴿ قَالُواْ وَأَقۡبَلُواْ ﴾ يوسف: ٧١، ﴿ قَوۡمِي يَعۡلَمُونَ ﴾يس: ٢٦.

## شەشەم/ درێژکردنەوەی پیتی پچڕاوی ئاسایی ( مَدّ الطَبِيعي فِي الحرُوف المُقَطعَة ):

بریتی یە لە درێژکردنەوەی پیتەکانی ( الطبيعي ) کە لە سەرەتای (١٩) سوڕەت لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە ، وە پیتەکان بریتین لە پێنج پیت لەم ووشەدا کۆ کراونەتەوە ( حَيّ طُهُرْ ) هەریەك لەو پیتانەی بە دوو پیت دەخوێندرێتەوە ، پیتی دووەمیان ( أَلِف )ە کە پیتی درێژکردنەوەیە ( مَدّ ) وە بە ئەندازەی دوو جووڵە درێژدەکرێتەوە وەك (مَدّ الطَبِيعي).

بەم شێوەیە دەردەبڕێت: ( حَا ، يَا ، طَا ، هَا ، رَا ) ، واتا ( أَلِف )ە کە لە وەستان و گەیاندن جێگیرە و بە (أَلِف) دەخوێندرێتەوە و درێژکردنەوەی تێدا نی یە.

- پیتی( را ) لە سەرەتای شەش ( ٦ ) سوڕەت هاتووە کە ئەمانەن :

﴿الٓر﴾ يونس: ١ ، ﴿الٓر﴾هود: ١ ، ﴿الٓر﴾يوسف: ١ ،

﴿الٓمٓر﴾الرعد: ١ ، ﴿الٓر﴾إبراهيم: ١ ، ﴿الٓر﴾الحجر: ١ .

- پیتی( ها ) لە سەرەتای دوو ( ٢ ) سوڕەت هاتووە کە ئەمانەن :

﴿كٓهيعٓصٓ﴾ مريم: ١ ، ﴿طه﴾طه: ١

- پیتی( طَا ) له سەرەتای چوار ( ٤ ) سوڕەت هاتووه که ئەمانەن :

﴿طه﴾طه: ، ﴿طسٓمٓ﴾ الشعراء: ١،﴿طسٓ﴾ النمل: ١،﴿طسٓمٓ﴾ القصص: ١

- پیتی( يَا ) له سەرەتای دوو ( ٢ ) سوڕەت هاتووه که ئەمانەن :

﴿كٓهيعٓصٓ﴾ مريم: ١ ، ﴿يسٓ﴾ يس: ١

- پیتی( حَا ) له سەرەتای حەوت ( ٧ ) سوڕەت هاتووه که ئەمانەن :

﴿حمٓ﴾غافر:١، ﴿حمٓ﴾فصلت:١، ﴿حمٓ﴾الشورى:١،

﴿حمٓ﴾الزخرف:١،﴿حمٓ﴾الدخان:١، ﴿حمٓ﴾الجاثية:١، ﴿حمٓ﴾الأحقاف:١

خوای گەوره له سەرەتای بیست و نۆ ( ٢٩ ) سوڕەت له قورئانی پیرۆز به پیتی پچڕاو دەستی پێکردووه ، که چوارده ( ١٤ ) [1] پیتی زمانی عەرەبی له خۆ دەگرێت ، وه له کۆی بیست و نۆ ( ٢٩ ) سوڕەتەکەش دا ( ١٩ ) نۆزده یان به پیتەکانی ( طبيعي ) دەست پێ کراون.

---

[1]) بەچوارده شێوه هاتووه له قورئانی پیرۆز که بریتین له:

﴿الٓمٓ﴾البقرة: ١،﴿الٓمٓصٓ﴾الأعراف: ١،﴿الٓرٰ﴾يونس: ١ ، ﴿الٓمٓرٰ﴾ الرعد: ١ ، ﴿طه﴾ طه: ١ ،

﴿كٓهيعٓصٓ﴾ مريم: ١ ، ﴿طسٓمٓ﴾ الشعراء: ١ ، ﴿طسٓ﴾ النمل: ١ ، ﴿يسٓ﴾ يس: ١،

﴿صٓ﴾ ص: ١ ، ﴿حمٓ﴾ فصلت: ١،﴿عٓسٓقٓ﴾الشورى: ٢ ، ﴿قٓ﴾ق: ١ ، ﴿نٓ﴾ القلم: ١

**حەوتەم/ بە یەک گەیشتنی دوو پیتی ( ساکن ) لە نێوان دوو ووشە لە قورئانی پیرۆزدا ( التقاء الحرفين الساكنين في القرآن الكريم ).**

لەم بابەتە مەبەستمان تەنها پیتی درێژکردنەوەیەکە دەگات بە پیتێکی (ساکن) کە بریتی یە لە نەخوێندنەوەی پیتی ( مدّ ) لە کاتی گەیاندنی بە ووشەی دوای خۆی بە مەرجێك پیتی یەکەمی ووشەی دووەم (ساکن) بێت .

نموونە:

﴿ وَقَالَا ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ﴾النمل: ١٥ ، ﴿ فِي ٱلۡكَلَٰلَةِ ﴾النساء: ١٧٦ ،

﴿ وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ﴾الزمر: ٧٤.

## ڕوونکردنەوە:-

| پیتی درێژکردنەوە | نموونە | لە کاتی وەستان دەخوێندرێتەوە. | لە کاتی گەیاندن ناخوێندرێتەوە. |
|---|---|---|---|
| ـَـ ا | ﴿ وَقَالَا ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ﴾ | ﴿ وَقَالَا ﴾ | ﴿ وَقَالـــ ٱلْحَمدُ ﴾ |
| ـُـ و | ﴿ وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ﴾ | ﴿ وَقَالُواْ ﴾ | ﴿ وَقَالـــ ٱلْحَمدُ ﴾ |
| ـِـ ی | ﴿ فِي ٱلۡكَلَٰلَةِ ﴾ | ﴿ فِي ﴾ | ﴿ فِلْــكَلالَة ﴾ |

# ( پوختەو کورتەی بەشەکانی درێژکردنەوەی ئاسایی )

درێژکردنەوەی بنەرەتی بەئەندازەی دووجووڵە درێژ دەکرێتەوە : ﴿قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ﴾

درێژکردنەوەی سروشتی
( مَدُّ الطبيعي ) : وەك
قَال ، قِيل ، يقُول

درێژکردنەوەی پیتی پچڕوای ئاسایی
( مَدُّ الطبيعي فِي الحرُوف المقطعة ): وەك
( حي طهر ) طه ، كٓهيعٓصٓ ، الٓر

درێژکردنەوەی گۆڕاو
( مَدُّ البَدَلْ ) : وەك
ءَادَم - أُوْتُوا - إِيلاف

درێژکردنەوەی جێگیر ( مَدُّالتمكين ) :
وەك ( حُيِّيتُم ) ( ٱلنَّبِيِّـۧن )

درێژکردنەوەی لە بڕی
( مَدُّ العِوَضِ ) : وەك
( ماءً ، ماءا )،
( غفوراً ، غفورا )

درێژکردنەوەی گەیاندنی بچووک
( مَدُّ صلة الصغرى ) : وەك
( مَلَكُوتُ بِيَدِهِۦ) (نَوْمٌۚ وَلَا سِنَةٌ تَأْخُذُهُۥ لَا )

## درێژکردنەوەی نائاسایی - لاوەکی - لقی ( المَدُّ الفرعي )

### درێژکردنەوە بەهۆی ( همزة ) وە

- درێژکردنەوەی بەیەك گەیشتوو ( المَدُّ الواجب المُتصِل )
- درێژکردنەوەی گونجاوی جودا ( المَدُّ الجائز المُنْفَصِل )
- درێژکردنەوەی گەیاندنی گەورە ( المَدُّ الصِّلة الكبرى )

### درێژکردنەوەی بەهۆی ( سکون )ەوە

- درێژکردنەوەی پێویست بە هەموو جۆرەکانی یەوە ( المَدّ الازم بِأنواعِهِ )
- درێژکردنەوە بەهۆی ( سکون )ی تووشهاتوو(المَدّ العارض للسكون)
- درێژکردنەوەی ناسك ، ئاسان ، نەرم ( المَدّ اللِّين )

## هەشتەم/ درێژکردنەوەی بەیەك گەیشتوو ( المَدُّ الواجِبُ المُتَصِلْ )

بریتی یە لە درێژکردنەوەی پیتەکانی ( المَدّ ) بەمەرجێك لە دوایەوە پیتی ( همزة ) هاتبێت و لە ناو یەك ووشەدا بەیەك بگەن ، لەم کاتەدا پێویستە ( واجبة ) دەنگ درێژبکرێتەوە بە ئەندازەی ( ٤ یان ٥ ) جووڵە (حركة) لە کاتی ڕۆیشتن بەسەر ووشەکە ، بەلاَم ( ٤ ) جووڵە لەپێشترە لە جێبەجێکردن ، هەروەکو شێخ (السمنودي) ڕەحمە تی خوای لیٚ بێت دەفەرمویٚ: (...خَمْساً وَ أَربعاً وَهَذَا أَعدِلُ )، بەلاَم ئەگەر فێرخواز وەستا لە کۆتایی ووشەکە ئەوکات دەبێت بە( عارض للسکون ) دروستە فێرخواز ئەوکات بە ئەندازەی (٤ – ٥ – ٦) جووڵە دەنگ درێژبکاتەوە.

نموونە:

﴿ يَشَآءُ ﴾ القصص: ٨٢ ، ﴿ سُوٓءُ ﴾ محمد: ١٤ ، ﴿ ٱلْمُسِىٓءُ ﴾ غافر: ٥٨.

## تێبینی لەسەر درێژکردنەوەی بەیەك گەیشتوو ( المَدُّ الواجِبُ المُتَصِلْ )

- بۆیە ناونراوە ( واجب ) پێویست ، چونکە گشت قاریئەکان هاودەنگن لەسەر درێژکردنەوەی لە دوو جووڵە ( حركة ) زیاتر.
- هۆی ناونانی بەیەك گیشتوو ( المتصل ) ، ئەوەیە کە پیتی درێژکردنەوە ( المَدّ ) لەگەلْ ( همزة )دا لەناو یەك ووشە بەیەك دەگەن و کۆدەبنەوە .

- پێویستە لەسەر قورئان خوێن وریا بێت لە دەربڕینی ( **همزة** ) لە کاتی وەستان لە کۆتایی ووشە بەبێ تووند کردن و هەژان( **قلقلة** ) و ئاسان ( **تسهيل** ) کردن.
- ئەگەر هاتوو چەند ( **مَدّ** )ێك لە ( **متصل و منفصل** ) کۆبۆنەوە لەکاتی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز ئەوا پێویستە لەسەر قورئان خوێن یەکسانی بکات لە ئەندازەی ( **مَدّ** )ەکان یان ( ٤ – ٤ ) یان ( ٥ – ٥) ، نابێت هەندێك شوێن بە ( ٣ ) بێت یان بە ( ٤ ) یان بە ( ٥ ) بێت ، هەروەکو ( **إبن جزري** ) دەفەرموێت: ( **وَاللَّفْظُ فِي نَظِيْرِهِ كَمِثْلِهِ** ) بۆیە پێویستە فێرخواز وریا بێت لەم جۆرە هەڵانە کە شاراوەن و خۆی لێ بپارێزێت تا پاداشتی تەواو بە دەست بێنێت لە لای خوای گەورە.

نموونە:

﴿ مُّذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَٰلِكَ لَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ وَلَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ ﴾ النساء: ١٤٣،

﴿ وَلْيَحْكُمْ أَهْلُ ٱلْإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِ ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴾ المائدة: ٤٧

## نۆیه‌م/ درێژكردنه‌وه‌ی گونجاوی جودا – ڕێپێدراو ( المَدُّ الجَائِزِ المُنْفَصِلْ )

بريتى يه له‌وه‌ى كه پيتى درێژكردنه‌وه ( المَدّ ) له كۆتايى ووشه‌ى يه‌كه‌م بێت، وه‌پيتى ( همزة ) له سه‌ره‌تاى ووشه‌ى دووه‌م بێت به‌مه‌رجێك به‌يه‌ك بگه‌ن ئينجا ده‌بێته درێژكردنه‌وه‌ى ده‌نگ به ئه‌ندازه‌ى ( ٤ يان ٥ ) جووڵه ( حركة )، به‌ڵام ( ٤ ) جووڵه له‌پێشتره له جێبه‌جێكردن ، هه‌روه‌كو شێخ ( السمنودي ) ره‌حمه‌تى خواى لێ بێت ده‌فه‌رموێ: ( ... خَمْساً وَ أربعاً وَهَذَا أعدِلُ ).

نموونه:

﴿بِمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ﴾ يوسف: ٣، ﴿وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ﴾ النور: ٣١ ،

﴿فِيٓ أَنفُسِكُمْ﴾ الحديد: ٢٢ .

## روون كـــردنه‌وه :-

| جووڵه | به‌يه‌ك گه‌يشتنى هه‌ردوو ووشه‌كه. | جووڵه | له‌كاتى وه‌ستان له‌سه‌ر پيتى (مَدّ) | نموونه |
|---|---|---|---|---|
| (٤ – ٥) | ﴿بِمَآ ← أَوْحَيْنَآ﴾ | (٢) | ﴿بِمَآ﴾ | ﴿بِمَآ أَوْحَيْنَآ﴾ |
| (٤ – ٥) | ﴿وَتُوبُوٓاْ ← إِلَى ٱللَّهِ﴾ | (٢) | ﴿وَتُوبُوٓاْ﴾ | ﴿وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ﴾ |
| (٤ – ٥) | ﴿فِيٓ ← أَنفُسِكُمْ﴾ | (٢) | ﴿فِيٓ﴾ | ﴿فِيٓ أَنفُسِكُمْ﴾ |

## تێبینی لەسەر درێژکردنەوەی ڕێپێدراوی جودا /

❖هۆی ناونانی بە ڕێپێدراو ( جائز )، چونکە لە چەند ڕیوایەتێکی تر گونجاوە ( ڕێپێدراوە ) بە دوو جووڵە درێژبکرێتەوە ، واتە: لە بنەڕەتدا ( أصل ) بە کورتی ( قصر ) دەخوێندرێتەوە ، وەك لە ریوایەتی (قالون)، قرائەی ( إبن كثير ، أبو عمرو البصري ).

❖هۆی ناونانی بە لێك جودا ( منفصل ) ، چونکە پیتەکانی ( المَدّ ) لە ووشەیەکە و ( همزة ) ش لە ووشەیەکی ترەو بە جودا هاتووە.

❖ئەندازەی درێژکردنەوەی گونجاوی لێك جودا بە ئەندازەی (٤ یان ٥ ) جووڵە ( حركة ) درێژدەکرێتەوە لە ڕێگای ( الشاطبية ) ئەوەش ڕێگای زۆربەی هەرە زۆری خەڵکە لەم ڕۆژگارەدا ، بەڵام درێژکردنەوە بە ئەندازەی دوو ( ٢ ) جووڵە ( حركة ) لە ڕێگای ( طيبة النشر )ە. دەبێت فێرخواز لە دەم و زاری مامۆستاکەی وەری بگرێت و شارەزابێت ، بۆیە پێویستە لەکاتی خوێندنەوەی لێك جودا ( منفصل ) بە دووجوڵە ، ڕەچاوی جیاوازی نێوان ڕێگای ( الشاطبية ) و ( الطيبة ) بکات.

❖ ڕێگاکان زۆرن بەڵام ئێمە نزیکترین ڕێگا هەڵدەبژێرین بۆ ئەم باسە کە ڕێگای ( روضة الحافظ )ە و لە چەند خاڵێك کورتی دەکەینەوە :

١- پێویستە درێژکردنەوەی بەیەك گەیشتوو (المَدُّ الواجِبُ المُتَصِلْ ) بە ئەندازەی ( ٤ ) جووڵە ( حركة ) درێژ بکرێتەو.

٢ – وازهێنان له ووتنی ( الله أكبر ) له كۆتایی سوڕەتی ( الضحى ) تا كۆتایی سوڕەتی ( الناس ) ٠

٣–وازهێنان له درێژكردنەوەی ( لام )ی ووشەی ( التوحيد )

وەك :﴿ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ ﴾ الأنبياء : ٨٧

٤– وازهێنان له پچڕان و بێدەنگ بوون (السكت) لەپێش (همزة)ی (ألَ)

وەك: ﴿ وَٱلۡأَرۡضَ ﴾ التوبة : ٣٦ ، وه له پێش ( همزة ) ی﴿ شَيۡءٍ ﴾ التوبة : ١١٥ ، جا ئەگەر ووشەكان پچڕاو بن یان به یەك گەیشتوو بن.

٥– دیاری كردن و هێنانی ( بسملة ) له سەرەتای بەشەكان ( أجزاء ) به بێ وازهێنان، چونكه رێپێدراوه له لای ( الشاطبية ) بۆ پیرۆزی.

٦– خوێندنەوەی ( نون )ی ( ساكن ) بێ مینگه له كاتی گەیشتنی به پیته كانی ( لام – راء ).

٧– پێویست بوونی ( الإبدال ) كه گۆڕینی هەمزەی گەیاندنه به پیتی (المدّ) لەم كاتەدا ( مَدُّ اللازم ) دروست دەبێت به ئەندازەی شەش ( ٦ ) جووڵه ( حركة ) درێژ ده كرێته وه ، وەك لەم شەش ( ٦ ) شوێنەدا:

﴿ ءَآلذَّكَرَيۡنِ ﴾ الأنعام: ١٤٣، ١٤٤ ﴿ ءَآلۡـَٰٔنَ ﴾ يونس: ٥١، ٩١ ﴿ ءَآللَّهُ ﴾ يونس: ٥٩، النمل: ٥٩

واته: به بێ ئاسانكراو(تسهيل).

٨– پێویست بوونی ( إشمام ) له ووشەی ﴿ تَأۡمَ۫نَّا ﴾ يوسف: ١١، واته : خوێندنەوەی به بێ ( رَوم )

٩– پێویست بوونی تێك هەڵكێش كردنی پیتی ( ثاء ) لەگەڵ ( ذال ) نموونه : ﴿ يَلۡهَثۚ ذَّٰلِكَ ﴾ الأعراف: ١٧٦

١٠- پێویست بوونی تێك هەڵكێش كردنی پیتی ( باء ) لەگەڵ ( میم )

نموونە : ﴿ ٱرۡكَب مَّعَنَا ﴾ هود: ٤٢

١١- پێویست بوونی تێك هەڵكێش كردنی پیتی ( قاف ) لەگەڵ (كاف)

بە تەواوی ( كامل – محض ) نموونە : ﴿ نَخۡلُقكُّم ﴾ المرسلات: ٢٠

١٢- وازهێنان لە پچڕان و بێ دەنگ بوون ( السكت ) لەم ووشانە :

﴿ عِوَجَاۜ ﴾ الكهف: ١ ، ﴿ مَّرۡقَدِنَاۜ ﴾ يس: ٥٢ ، ﴿ مَنۡۜ رَاقٖ ﴾ القيامة: ٢٧ ، ﴿ كَلَّاۖ بَلۡۜ رَانَ ﴾ المطففين: ١٤

١٣- پێویست بوونی كورت ( قصر ) خوێندنەوەی پیتی ( عین ) لەم

دوو شوێنە : ﴿ كٓهيعٓصٓ ﴾ مريم: ١ ، ﴿ عٓسٓقٓ ﴾ الشورى: ٢

١٤- پێویست بوونی قەڵەو خوێندنەوەی پیتی ( راء ) لەووشەی

﴿ فِرۡقٖ ﴾ الشعراء: ٦٣، لە كاتی وەستان و ڕۆیشتن.

١٥- پێویست بوونی نەخوێندنەوەی پیتی ( یاء ) لە ووشەی

﴿ ءَاتَىٰنِۦَ ﴾ النمل: ٣٦ ، لەكاتی وەستان.

١٦- پێویست بوونی نەخوێندنەوەی پیتی ( ألِف ) لە ووشەی

﴿ سَلَٰسِلَاْ ﴾ الإنسان: ٤ لە كاتی وەستان.

١٧- پێویست بوونی خوێندنەوەی پیتی( صاد ) بە ( سین ) لە ووشەی

﴿ ٱلۡمُصَيۡطِرُونَ ﴾ الطور: ٣٧ .

١٨- گونجاوە ( ڕێپێدراوە ) خوێندنەوەی پیتی (صاد) لە ووشەی

﴿ بِمُصَيۡطِرٍ ﴾ الغاشية: ٢٢ ، بە (سین) و (صاد).

١٩- گونجاوە ( ڕێپێدراوە ) خوێندنەوەی پیتی ( صاد ) لەم دوو شوێنە: ﴿ وَيَبْصُۜطُ ﴾ البقرة: ٢٤٥، ﴿ بَصۜطَةً ﴾ الأعراف: ٦٩، بە ( سين ) و ( صاد ).

٢٠- گونجاوە ( ڕێپێدراوە ) خوێندنەوەی ﴿ يسٓ ۝١ وَٱلْقُرْءَانِ ﴾ يس: ١-٢، لەگەڵ ﴿ نٓ وَٱلْقَلَمِ ﴾ القلم: ١، لە کاتی گەیاندن بە تێک هەڵکێشان (إدغام) یان ئاشکرا ( الاظهار ).

٢١- گونجاوە ( ڕێپێدراوە ) خوێندنەوەی ﴿ ضَعْفٍ ﴾ الروم: ٥٤ ، بە (فتحة) و (ضمة) لە سێ جێگەکەی تر لەفەرمایشتی خوای پەروەردگار:

﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً ﴾ الروم: ٥٤

## تێبینی /

❖ ئەگەر خوێنەر بە ڕووی ئاشکراکردن خوێندی:

﴿ يسٓ ⟵ گەیاندن وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْحَكِيمِ ﴾ لەگەڵ ﴿ نٓ ⟵ گەیاندن وَٱلْقَلَمِ ﴾

ئەوە پێویستە ڕەچاوی ئەم خالانەی خوارەوە بکات

- خوێندنەوەی ووشەی ﴿ بِمُصَيْطِرٍ ﴾ الغاشية: ٢٢ ، تەنها بە ( صاد ).
- خوێندنەوەی ووشەی ﴿ وَيَبْصُۜطُ ﴾ البقرة: ٢٤٥ ، تەنها بە ( سين ).
- خوێندنەوەی ووشەی ﴿ بَصۜطَةً ﴾ الأعراف: ٦٩ ، تەنها بە ( سين ).
- خوێندنەوەی ووشەی ﴿ ضَعْفٍ ﴾ الروم: ٥٤ ، تەنها بە( فتحة ) .

بەم شێوەیە هاتووە لە گێڕانەوەی (الفيل عن عمرو بن الصباح عن حفص).

❖ ئه‌گه‌ر خوێنه‌ر به‌ رووى تێك هه‌ڵكێشكردن خوێندى:

﴿يسٓ﴾ ← ﴿وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡحَكِيمِ﴾ له‌گه‌ڵ ﴿نٓۚ﴾ ← ﴿وَٱلۡقَلَمِ﴾ ئه‌وه‌ پێويسته‌ ره‌چاوى ئه‌م خالأنه‌ بكات :

- خوێندنه‌وه‌ى ووشه‌ى ﴿بِمُصَيۡطِرٍ﴾ الغاشية: ٢٢ ، ته‌نها به‌ ( سين ) .
- خوێندنه‌وه‌ى ووشه‌ى ﴿وَيَبۡصُۜطُ﴾ البقرة: ٢٤٥ ، ته‌نها به‌ ( صاد ) .
- خوێندنه‌وه‌ى ووشه‌ى ﴿بَصۜۡطَةٗ﴾ الأعراف: ٦٩ ، ته‌نها به‌ ( صاد ) .
- خوێندنه‌وه‌ى ووشه‌ى ﴿ضَعۡفٖ﴾ الروم: ٥٤ ، ته‌نها به‌ ( ضمة ) .

به‌م شێوه‌يه‌ هاتووه‌ له‌ گێرانه‌وه‌ى (زرعان عن عمرو بن الصباح عن حفص).

## درێژكردنه‌وه‌ى رێپێدراوى جودا له‌ رووى نووسين دوو به‌شه‌

١- **الحقيقي** : بريتى يه‌ له‌وه‌ى كه‌ پيتى درێژكراو جێگيره‌ له‌ وێنه‌ (رسم) و ده‌ربڕين ( اللفظ ).

نموونه‌ : ﴿قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ﴾ التحريم: ٦.

٢- **الحكمي**: بريتييه‌ له‌وه‌ى كه‌پيتى درێژكراو نه‌نووسراوه‌ له‌وێنه‌ (رسم) و جێگيره‌ له‌ ده‌ربڕين ( اللفظ ).

نموونه‌ :﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾التحريم:٦، ﴿هَٰٓأَنتُمۡ﴾محمد:٣٨ ، ﴿هَٰٓؤُلَآءِ﴾محمد:٣٨

درێژكردنه‌وه‌ى يه‌كه‌م له‌﴿هَٰٓؤُلَآءِ﴾ له‌گه‌ڵ تێبينى دروست نيه‌ بوه‌ستين له‌سه‌ر به‌شى يه‌كه‌مى نموونه‌كان وه‌ك وه‌ستان له‌سه‌ر (يا) يان (ها) له‌ به‌ر ئه‌وه‌ى يه‌ك ووشه‌يه‌ له‌ وێنه‌دا ( رسماً )، جيا ناكرێته‌وه‌ پيتى(يا،ها) له‌ ووشه‌ كان.

**تێبینی/** پیتی( هاء ) لە ووتەی خوای پەروەردگار ﴿ هَآؤُمُ ﴾ الحاقة: ١٩ ، لە بنەڕەتی ووشەکە دایە، بۆ ئاگادارکردنەوە نیە ، ئەو درێژ کردنەوەی کە تیایەتی بە یەك گەیشتووە ( مد المتصل )ـە درێژکردنەوەی ڕێپێدراوی جودا ( مد المنفصل ) نیە.

## دەیەم/ گەیاندنی گەورە ( صلة الكبرى )

ئەم جۆرە هەمان گەیاندنی ( هاء )ی بچووکە ، بەڵام بە هۆکاری ( همزة ) درێژدەکرێتەوە کە لە دوای ( هاء )ـەوە هاتووە ، کە دەبێتە هۆی درێژکردنەوەی ( واو – یاء )ی بچووك لە کاتی گەیاندن بە ( همزة ).

نموونە :

﴿ رَبِّهِۦٓ أَحَدَۢا ﴾الكهف: ١١٠ ، ﴿ مَالَهُۥٓ أَخْلَدَهُۥ ﴾الهمزة: ٣ .

## یازدەیەم/ درێژکردنەوەی پەیوەست ( المَدُّ اللازِمُ )

بریتی یە لە هاتنی ( سکونی )[1] بنەڕەتی ( أصلي ) لە دوای پیتی درێژکردنەوەی پەیوەست ( سکون )ـەکە لە کاتی وەستان و ڕۆیشتن جیانابێتەوە ، ئەندازەی ئەم جۆرە درێژکردنەوەیە شەش ( ٦ ) جووڵە (حرکة) یە لە لای هەموو قاریئەکان.

( وَ يُمَدُّ لزوماً ستُّ حَرَكَاتٍ لِجَمِيعِ القُرَّءِ )

---

[1]) ئەو ( سکون )ـەیە کە پەیوەستە و گۆڕانکاری بە سەر نایەت لەکاتی گەیاندن و وەستان ، وە دەردەچێت لە ژێر درێژکردنەوەی پەیوەست ( اللازم ) بە هەموو جۆرەکانیەوە ، واتە ئەم ( سکون )ـە دەگرێتەوە کە بە هۆکاری وەستان لە سەر کۆتایی ووشە بە مەرجێك پیتی پێشی کۆتایی ( مَدُّ - اللِين) بێت.

# خشتەی بەشەکانی درێژکردنەوەی پەیوەست

## ( المَدّ اللازم )



## به‌شه‌كانی درێژكردنه‌وه‌ی په‌یوه‌ست

### یه‌كه‌م / درێژكردنه‌وه‌ی په‌یوه‌ست له ووشه‌ی قورس ( المَدُّ اللازِمُ المُثَقَّلُ الْكَلِمِيُّ )

بریتی یه له هاتنی پیتی ( ساكن )ی تێك هه‌ڵكێشراو له دوای پیتی درێژكردنه‌وه ( المَدّ )

وه‌ك : ﴿ دَآبَّةٍ ﴾ الأنعام: ٣٨ ، ﴿ أَتُحَـٰٓجُّوٓنِّي ﴾ الأنعام: ٨٠ • نموونه‌ی پیتی (یاء) نه‌هاتووه له قورئانی پیرۆز.

تێبینی له‌سه‌ر درێژكردنه‌وه‌ی په‌یوه‌ست ( المَدُّ اللازِمُ المُثَقَّلُ الْكَلِمِيُّ )

١- زۆرێك له خه‌ڵك ئه‌ندازه‌ی درێژكردنه‌وه‌ی ( اللازم ) له ( ٦ ) جووڵه ( حركة ) زیاتر درێژده‌كانه‌وه ده‌یگه‌یننه ( ٨ ) جووڵه ( حركة ) به هۆی ئاوازی نه‌شاز ، كه ئه‌م جۆره خوێندنه‌وه‌یه هه‌ڵه‌یه و ڕێگه‌پێنه‌دراوه ، پێویسته فێرخواز وریا بێت و خۆی لێ بپارێزێت.

بۆ ڕاهێنان فێرخواز پێویسته ده‌نگی خۆی تۆمار بكات به‌م شێوه‌یه ( ءَا ، ءُو ، ءِی ) هه‌ریه‌ك له‌م سێ پیته دوو جووڵه ( حركة ) درێژده‌كرێته‌وه ، واته ئه‌ندازه‌كه ده‌كاته ( ٦ ) جووڵه ( حركة ) جا پاشان ووشه‌ی ﴿دَآبَّةٍ﴾ یا ﴿ ٱلضَّآلِّينَ ﴾ بخوێنێته‌وه‌و تۆماری بكاتن پاشان گوێبیستی بێت ئه‌وكاته به‌رچاو ڕوون ده‌بێت له پێوه‌ری درێژكردنه‌وه‌كه‌دا.

٢- پێویسته فێرخواز ده‌نگ پیتی شه‌دده‌كه كه له دوای پیتی درێژكردنه‌وه دێت نه‌شارێته‌وه ، چونكه له‌م كاته‌دا پێویستی به پاڵه‌په‌ستۆی ده‌نگ هه‌یه له پیته شه‌دده‌كه.

٣- زۆرێك لەوانەی كە سەرەتان لە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز لە لای مامۆستاكەیان پیتی ( المَدّ ) جوولە (حركة) ی لەگەڵ تێكەڵ دەكەن بەم شێوەیەی خوارەوە:

❖ لە ووشەی: ﴿ تَأۡمُرُوٓنِّيٓ ﴾ الزمر: ٦٤ ( كسرة ) یەك دروست دەكات لە ژێر واوی ( المَدّ )ەكە لە پێش (نون)ەكە هاتووە بەڵام هەڵەكە شاراوەیە هەموو كەس هەستی پێ ناكات.

٤- زۆرێك لە خەڵكی زمانی پاڵ دەخات لە شوێنی دەرچوونی پیتی (لام) لە دەربڕینی ووشەی ﴿ ٱلضَّآلِّينَ ﴾ بە شێوەیەك كاتێكی خایەنراوی پێ دەبەخشێت ، واتە سیفەتی مام ناوەندی ( التوسط ) دەگۆڕێت لە پیتی (لام) بۆ سیفەتی خاوی (الرخوة) ئەمەش ڕێگەپێنەدراوە.

٥- هەندێك لە خەڵكی پیتی ( لام ) لە بۆشایی لووتەوە دەری دەهێننە دەرەوە یان تێكەڵی دەكەن بە پیتی ( یاء ) نازاندرێت ئەم پیتە ( لام یان یاء)ە ئەمە درێژكردنەوەیە یان مینگەیە نابیسترێت تەنها دەنگێكی مینگەیە لە بۆشایی لووت دەردەچێت لە ( لام )ی ووشەی ﴿ ٱلضَّآلِّينَ ﴾

## روون كردنەوە /

| پیت | نموونە | لە بنەرەتدا پیتی یەكەمی دوای (مَدّ) | پیتی دووەم | نووسین و خوێندنەوە. |
|---|---|---|---|---|
| ـَـ ا | ﴿ ٱلصَّآخَّةُ ﴾ عبس: ٣٣ | خْ | خَ | آ + خْ + خَ = خَّ |
| ـُـ و | ﴿ أَتُحَٰٓجُّوٓنِّي ﴾ الأنعام: ٨٠ | نْ | نَـ | و~ + نْ + نِـ = نِّ |

## دووەم / درێژکردنەوەی پەیوەست لە ووشەی سووك (المَدُّ اللازِمُ المُخَفَّفُ الْكَلِمِيُّ )

بريتی يە لە هاتنی پيتی ( ساكن ) لە دوای پيتی درێژكردنەوە ( مَدّ )

وەك : ﴿ ءَآلْـَٰٔنَ وَقَدْ كُنتُم بِهِۦ تَسْتَعْجِلُونَ ﴾ يونس: ٥١ ، ﴿ ءَآلْـَٰٔنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَكُنتَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴾ يونس: ٩١ ، سێيەمی نی يە لە قورئانی پيرۆز تەنها لەم دوو شوێنە هاتووە.

## سێ يەم / درێژكردنەوەی پەيوەست لە پيتی قورس ( المَدُّ اللازِمُ المُثَقَّلُ الحَرْفِيُّ ).

بريتی يە لە هاتنی يەكێك لە پيتەكانی درێژكردنەوە لە سەرەتای هەندێك لە سورەتەكانی قورئانی پيرۆز ، ئەم جۆرەش تەنها لە پيتی (لام) و ( سين ) تێك هەڵكێشان دروست دەبێت كە پيتی سێيەم شەددە وەردەگرێت و دەبێت بە درێژكردنەوەی ( لازِمُ المُثَقَّلُ الحَرْفِيُّ ) ، وەك:

﴿ الٓمٓ ﴾ آل عمران: ١ ، ﴿ طسٓمٓ ﴾ الشعراء: ١ .

## روون كردنەوە /

﴿ الٓمٓ ﴾ [ تێك هەڵكێشی دەكرێ ( ميم ) لەگەڵ ( ميم ) ] ← ( أَلِفْ لَآم مِّيمْ )

﴿ طسٓمٓ ﴾ [ تێك هەڵكێشی دەكرێ ( نون ) لەگەڵ ( ميم ) ] ← ( طَا سِين مِّيمْ )

## چوارەم / درێژکردنەوەی پەیوەست لە پیتی سووک ( المَدُّ اللازِمُ المُخَفَّفُ الحَرْفِيُّ )

بريتی يه له هاتنی يەکێك له پيتەکانی درێژکردنەوە له سەرەتای هەندێك له سورەتەکانی قورئانی پیرۆز ، هەر پيتێك له پيتەکان بە سێ پيت دەخوێندرێتەوە به بێ تێك هەڵکێشان بە پێچەوانەی ( المُثَقَّلْ ) ، وەك :

﴿ قٓ ﴾ق: ١ جۆری خوێندنەوە : ﴿ قآف ﴾ ، له ﴿ صٓ ﴾ص: ١ جۆری خوێندنەوە :

﴿ صآد ﴾ ، پيتی درێژکردنەوەکە ( ألِفَ )ـه کەوتۆتە ناوەڕاستی سێ پيتەکە بە ئەندازەی ( ٦ ) جووڵە ( حرکة ) درێژدەکرێتەوە.

## تێبينی/

پيتی ( عَيْن ) له سەرەتای دوو سورەت هاتووە لە قورئانی پیرۆز دروستە لە دەربڕین بە ئەندازەی ( ٤ - ٦ ) جووڵە( حرکة ) درێژ بکرێتەوە ، چونکە پيتی( يا ) له ( عَيْن ) سيفەتی نەرم ( اللين )ی هەيە ، بەڵام ( ٦ ) جووڵە ( حرکة ) چاکترە ، وەك ئەم دێرە هۆنراوەیە کە شێخ ( الجمزوري ) دەفەرمووێ: ( وَعَيْنُ ذُو وَجِهَيْنِ والطُول أَخَصّ ).

نموونە :

﴿ كٓهيعٓصٓ ﴾ مريم: ١، ﴿ حمٓ ۝١ عٓسٓقٓ ﴾ الشورى: ١ - ٢.

## دوانزەیەم/ درێژکردنەوەی تووشهاتوو – له ناکاو– به هۆی (سکون)ـەوه (المَدُّ الْعَارِضُ لِلسُّكُونِ)

بریتی یه له وەستانی له ناکاو له کۆتایی ووشه بەمەرجێك پیتی پێش کۆتایی پیتی درێژکردنەوه بێت (ـَـ ا ، ـُـ و ، ـِـ ی ).

وەك : ﴿ٱلۡعِقَابِ﴾ الأنفال: ١٣، ﴿يَعۡلَمُونَ﴾ التوبة: ٦ ﴿ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ الشعراء: ٧٧.

درێژکردنەوه بەهۆی ( سكون )ی نائاسایی دروسته بۆ قورئان خوێن به ئەندازەی ( ٢ – ٤ – ٦ ) جووڵه (حركة) پیتەکانی ( المَدّ ) درێژبکاتەوه.

تێبینی/– فێرخوازی بەرێز وریابه ئەگەر هاتوو له دەستپێکی قورئان خوێندن بەیەك لەم جۆره جوولانه (٢ –٤ –٦) جووڵه دەستت پێکرد ئەوه دەبێت پابەند بیت تا کۆتایی قورئان خوێندنەکه ، نابێت به ئارەزووی خۆت له نێوان ( عارض )ـەکان کەم و زیاد بکەی لەیەك کاتدا وەك (ابن الجزري )رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێ:

( وَاللَّفْظُ فِـي نَظِيْرِهِ كَمِثْلِهِ )

### خشتەیەك بۆ گونجان لەگەڵ شێوازەکانی قورئان خوێندن

| شێوازی خوێندن | چاك وایه بۆ خوێندن بەم شێوەیه بێت |
|---|---|
| الحَدْر | به دوو جووڵه ( حركة ) بێت ( عارض للسكون ) |
| التَدْوِير | به چوار جووڵه ( حركة ) بێت ( عارض للسكون ) |
| التَحْقِيق | به شەش جووڵه ( حركة ) بێت (عارض للسكون) |

– هۆی ناونانی بە ( عارض للسكون ) چونكە پیتی كۆتایی ووشەكە لە بنچینەدا ( سكون ) نیە بەڵكو بەهۆكاری وەستان لەسەر پیتی كۆتایی ووشەكە كە دەبێت بە ( سكون ) ، بەڵام لە كاتی گەیاندن ( الوصل ) لەگەڵ ووشەی دوای خۆی دەبێت بە ( المَدّ )ی ئاسایی (الطبیعي ).

نموونــــە :

﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ← لە كاتی گەیاندن ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ الفاتحة: ٢ – ٣.

## سیانزەیەم/ درێژكردنەوەی نەرم ( ناسك ، ئاسان ) ( المَدُّ اللِّین )

بریتی یە لە وەستانی لەناكاو ( عارض ) لە كۆتایی ووشە بە مەرجێك پیتی پێش كۆتایی پیتی ( اللین ) بێت: ( ـَ و ، ـَ ي ) بە هۆی وەستان، دەبێتە هۆی درێژكردنەوە.

وەك:

﴿نَوْمٌ﴾ ، ﴿قُرَيْشٍ﴾، ﴿وَٱلصَّيْفِ﴾ ، ﴿ٱلْبَيْتِ﴾، ﴿خَوْفٍ﴾

لە كاتی وەستان دروستە بە ئەندازەی ( ٢ – ٤ – ٦ ) جووڵە (حركة) درێژبكرێتەوە ، بەڵام ئەگەر هات و نەوەستاین لە سەر ووشەی ﴿نَوْمٌ﴾ گەیاندمان بە دوای خۆی لەم كاتە وەك خۆی دەخوێندرێتەوە ، بەبێ ئەم جۆرە جوڵانەی كە ئاماژەمان پێكرد.

نموونە :

﴿لَا تَأْخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ ← لە كاتی گەیاندن لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾

## کۆبوونەوەی پیتەکانی ( مَدُّ اللّین ) لە ( عارض للسکون )

ئەگەر لە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز درێژکردنەوەی لە ناکاو ( عارض للسکون ) لەگەڵ درێژکردنەوەی ئاسان ( اللّین ) کۆبۆوە ئەوە پێویستە لە سەر قورئان خوێن ئەندازەی ( مَدُّ اللّین ) یەکسان یان کەمتر بکات لە ( المَدُّ الْعَارِضُ لِلسُّکُونِ )، واتە هیچ کاتێك ( مَدُّ اللّین ) ئەندازەی زیاتر نیە لە ( المَدُّ الْعَارِضُ لِلسُّکُونِ ).

## خشتەیەك بۆ گونجان لەگەڵ ( مَدُّ اللّین ، الْعَارِضُ لِلسُّکُونِ )

| درێژکردنەوەی لە ناکاوی بەبێ ئاسان (اللین) | | درێژکردنەوەی لە ناکاوی ئاسان ( اللین ) | |
|---|---|---|---|
| (٢) جووڵە | ﴿ ٱلۡعِقَابِ ﴾ | (٢) جووڵە | ﴿ نَوۡمٌ ﴾ |
| (٤) جووڵە | ﴿ يَعۡلَمُونَ ﴾ | (٢ ، ٤) جووڵە | ﴿ قُرَيۡشٍ ﴾ |
| (٦) جووڵە | ﴿ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ | (٢ ، ٤ ، ٦) جووڵە | ﴿ ٱلۡبَيۡتِ ﴾ |

# خشتەی ئەندازەی درێژکردنەوەکان بە گشتی



## بنچینەی بەهێزترینی دوو هۆکارەکانی درێژکردنەوە

السكون — الهمزة

١. بەهێزترینیان ( اللازم ).

٢. بە یەك گەیشتوو ( المتصل ).

٣. سکونداری لە ناکاو ( العارض للسكون ).

٤. گونجاوی جودا – رێپێدراو– ( جائز المنفصل ).

٥. گۆڕاو ( البدل ).

زانای قورئان خوێن شێخ ( إبْرَاهِيم عَليّ شَحَاتَةَ السَّمَنُّودِيُّ )– ( رەحمەتی خوای لێ بێت ) دەفەرمووێ :–

أَقوَى المَدُودِ : لَازِمٌ فما اتَّصَلْ فعارِضٌ فَذُو انفِصَالٍ فَبَدَلْ

وَسَبَبَا مَـدٍّ إِذَا مَـا وُجِـــدَا فَأَنَّ أَقْوى السَّبَبَيْنِ انْفَــرَدَا

**واتــە :**

بەهێزترین درێژکردنەوە پەیوەستە پاشان بەیەك گەیشتوو

پاشان تووش هاتوو جا گونجاوی جودا دواتر گۆڕاو

وە ئەگەر دوو هۆکاری درێژکردنەوە پێکەوە بوون

کامەی بەهێزترە لەم دوو هۆکارانە ئەوە مافی

خۆیەتی بە تەنها پێش خەرێ

## شیکرنەوەی جۆرەکانی بەیەك گەیشتنی دوو هۆکارەکان

١- کۆبوونەوەی پەیوەست ( اللازم ) و گۆڕاو ( البدل ) : واتە ئەگەر پەیوەست و گۆڕاو لە سەر پیتێکی درێژکردنەوە کۆبوونەوە ، ئەوە کار بە ( مَدّ اللازم )ـەکە دەکرێت و( مَدّ البَدَلْ ) فەرامۆش دەکرێ ، کار بە بنچینەی بەهێزترین هۆکارەکانی درێژکردنەوە ( المَدّ ) دەکرێ ،

وەك : ﴿ ءَآلذَّكَرَيْنِ ﴾ الأنعام: ١٤٣ ، ﴿ ءَآلْـَٔنَ ﴾ يونس: ٥١ ، ﴿ ءَآللَّهُ ﴾ النمل: ٥٩،

ئەم سێ ووشەیە بە ناوێکی تریش ناسراون لە نێو پەرتووکەکانی (تجوید) بە درێژکردنەوەی لێك جیاکردنەوە ( المَدُّ الفَرق )، واتە جیا دەکاتەوە لە نێوان هەواڵ و جێگای پرسیار .

نموونە : ﴿ ءَآللَّهُ خَيْرٌ أَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ النمل: ٥٩ واتە : ئایا خودا چاکترە؟ یا ئەوەی دەیکەن بە هاوەڵی . بڕگەی یەکەم پرسیارە وە بڕگەی دووەم جیاکردنەوەیە لە رووی هاوەڵ پەیداکردن ( شرك ) بۆ خوای پەروەردگار لە وەڵامدا پەرستن و یەك خواناسی هەر بۆ خوای گەورە دەبێت.

٢- کۆبوونەوەی بەیەك گەیشتوو( المتصل ) گۆڕاو( البدل ) : واتە ئەگەر بەیەك گەیشتوو گۆڕاو لە سەر پیتێکی درێژکردنەوە کۆ بوویە وە ئەوە کار بە ( المتصل ) دەکرێ و درێژکردنەوە ( بَدّل ) فەرامۆش دەکرێ ، کار بە بنچینەی بەهێزترینی هۆکارەکانی درێژکدنەوە ( المَدّ ) دەکرێ.

وەك : ﴿ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ ﴾ البقرة: ٢٦٤.

٣- کۆبوونەوەی گونجاوی جودا (جائز المنفصل) لەگەڵ گۆڕاو (البدل): واتە ئەگەر کۆبۆوە درێژکردنەوەی جودا لەگەڵ ( مَدُّ البَدَل ) لەسەر پیتێکی درێژکردنەوە(مَدّ)ئەوە کار بە هۆکارە بەهێزەکە دەکرێ ، بێ هێز (لاوان)ـەکە فەرامۆش دەکرێ ، ئەگەر هەر دوو کیان یەکسان بوون لە رووی هێزەوە کار بە هەردووکیان دەکرێت، وەك: ﴿ وَجَآءُوٓ أَبَاهُمْ عِشَآءً يَبْكُونَ ﴾ يوسف١٦

٤- کۆبوونەوەی بەیەك گەیشتوو ( المتصل ) لەگەڵ ( عارض للسکون ) :

واتە ئەگەر درێژکردنەوەی بەیەك گەیشتوو لەگەڵ ( سکون )ی لەناکاو لەسەر پیتی درێژکردنەوە ( المدّ ) کۆبۆوە ، ئەوا کار بە هۆکارە بەهێزەکە دەکرێ بێ هێز ( لاواز )ەکە فەرامۆش دەکرێ ، ئەگەر هەردووکیان یەکسان بوون لە رووی هێزەوە کار بە هەردووکیان دەکرێ .

وەك : ﴿ ٱلسَّمَآءِ ﴾ الغاشیة: ١٨ ﴿ قُرُوٓءٍ ﴾ البقرة: ٢٢٨ ، ﴿ ٱلْمُسِىٓءُ ﴾ غافر: ٥٨.

## روونکردنەوە:

### نموونە:

| وەستانی لە ناکاو (تووش هاتوو) | جووڵە | درێژکردنەوەی بەیەك گەیشتوو لەکاتی رۆیشتن | جووڵە | درێژکردنەوەی بە یەك گەیشتوو لە کاتی وەستان | جووڵە |
|---|---|---|---|---|---|
| ﴿ ٱلسَّبِيلَ ﴾ | ٢ | ﴿ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ لَسۡتُنَّ كَأَحَدٖ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ﴾ | ٤ | ﴿ ٱلنِّسَآءِ ﴾ | ٤ - ٥ - ٦ |
| ﴿ ٱلسَّبِيلَ ﴾ | ٤ | ﴿ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ لَسۡتُنَّ كَأَحَدٖ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ﴾ | ٥ | ﴿ ٱلنِّسَآءِ ﴾ | ٥ - ٦ |
| ﴿ ٱلسَّبِيلَ ﴾ | ٦ | ﴿ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ لَسۡتُنَّ كَأَحَدٖ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ﴾ | ٥ | ﴿ ٱلنِّسَآءِ ﴾ | ٦ |

## بەراوردێك لە نێوان بەشەكانی درێژكردنەوەی نائاسایی — لاوەكی ( مُقَارَنَةٌ بَيْنَ أَنواعِ المُدُود الفرعيَّة )

١- **اللازم** : بریتی یە لەو درێژكردنەوەیە كە كۆی قاریئەكان لەسەر درێژكردنەوە ( مَدّ )ەكەن ، وە هەروەها هاودەنگن لەسەر ئەندازەی درێژكردنەوەكەش ئەوەش بریتی یە لە (المَدُّ اللازم) لە زاراوەدا (اصطلاحاً).

٢- **الواجب** : بریتی یە لەودرێژكردنەوەی كە كۆی قاریئەكان هاودەنگن لەسەر درێژكردنەوەی لە دوو جووڵە ( حركة ) زیاتر بەڵام راجیان لەسەر ئەندازەی درێژكردنەوەكە ئەمەش بریتی یە لە( المَدُّ المتصل ).

٣- **الجائز** : بریتی یە لەو درێژكردنەوەی كە قاریئەكان رای جیایان هەیە سەبارەت بە كورتكردن و درێژكردنەوەی ( المَدّ ، القَصر ) لەپیتەكانی ( المَدّ ) هەروەها راجیان لە ئەندازەی درێژكردنەوە ، ئەمەش ئەم بەشانە لەخۆ دەگرێت:( المُنْفَصِل ، الصِلة الكُبرى ، العَارِضْ للسُكون ، مَدُّ اللِّين ).

# بەشەکانی درێژکردنەوە بە گشتی

- المد الأصلي يمد بمقدار حركتين ﴿قَالَ يَـٰمُوسَىٰٓ﴾
  - المد الطبيعي ﴿قَالَ – قِيلَ – يَقُولُ﴾
  - مد البدل : ﴿ءَادَمَ – أُوتُوا۟ – إِيمَـٰنِهِمْ﴾
  - مد العوض : ﴿قَلِيلًا – مُّبِينًا – بِنَآءً﴾
  - مد الصلة الصغرى : ﴿وَبَيْنَهُۥ مَوَدَّةً﴾
  - مد التمكين : ﴿وَٱلْأُمِّيِّـۧنَ – ٱلنَّبِيِّـۧنَ﴾
  - الحروف المقطعة : ( حَيٌّ طَهُرَ ) ﴿طه﴾
  - تسقط المد عند التقاء الساكنين ﴿فِى ٱلْكَلَـٰلَةِ – وَقَالُوا۟ ٱلْحَمْدُ – ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ﴾
- المد الفرعي
  - المد الفرعي بسبب الهمز
    - المد الواجب المتصل نحو : ﴿أُو۟لَـٰٓئِكَ﴾ ﴿قُرُوٓءٍ﴾ ﴿سِيٓءَ﴾
    - المد الجائز المنفصل نحو : ﴿بِمَآ أُنزِلَ﴾ ﴿قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا﴾ ﴿يَـٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾
    - مد الصلة الكبرى نحو : ﴿فِى حُكْمِهِۦٓ أَحَدًا﴾ ﴿هَـٰذِهِۦٓ أَبَدًا﴾ ﴿مَالَهُۥٓ أَخْلَدَهُۥ﴾
  - المد الفرعي بسبب السكون
    - المد العارض للسكون نحو ﴿حِسَابِ – مُّعْرِضُونَ – قَدِيرٌ﴾ يجوز فيه : القصر و التوسط و الطول
      - يلحق به
        - مد اللين نحو : ﴿قُرَيْشٍ – خَوْفٍ﴾ يجوز فيه : القصر والتوسط والطول
    - المد بسبب السكون اللازم
      - المد اللازم الحرفي
        - المثقل حرفي نحو : ﴿طسٓمٓ﴾
        - المخفف نحو : ﴿قٓ – نٓ﴾
      - المد اللازم الكلمي
        - المثقل نحو : ﴿ٱلْحَآقَّةُ﴾
        - المخفف نحو : ﴿ءَآلْـَٔـٰنَ﴾
          - مدُّ الفرق : للفرق بين الاستفهام والخبر .. نحو : ﴿قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ﴾

الحروف المقطعة ١٤ ( نَصٌّ حَكِيمٌ قَطَعًا لَهُ سِرٌّ )

## هەمزەی گەیاندن ( همزة الوصل )

لەم باسە بناغەیەکی باو هەیە کە دەگوترێ: ( لا تَبْدَأُ العَرَبُ بِسَاكِنٍ ، وَلاَ تَقِفُ عَلى مُتَحَرِّكٍ ) واتە: عەرەب لە دەستپێکا بە ( ساکن ) دەست پێ ناکات، وەلە کاتی وەستانیش بە جوولّە ناوەستێت لە کۆتایی ووشە.

لەم بابەتە ئەوە وەردەگیرێت کە سەرەتای هەر ووشەیەکی قورئانی پیرۆز لە دەستپێکا بە ( ساکن ) نایەت و نابێت ، ئەگەر ووشەیەك لە سەرەتا ( ساکن ) بێت ئەوا عەرەب همزەی گەیاندن لە سەرەتای ووشەکەدا دەنێت بۆ رزگارکردنی زمان لە دەربڕینی ووشەکە بە قورسی، بۆیە شێخ ( خَلِيلْ بنُ أَحَمْد ) رەحمەتی خوای لێ بێت ئەم جۆرە گەیاندنە ناو دەبات بە پەیژەی رزگاربوونی زمان.

## پێناسەی هەمزەی گەیاندن ( همزة الوصل )

بریتی یە لەو هەمزەیەی کە زمان رزگار دەکات لە دەست پێکا لە(ساکن) وە جێگیر دەبێت لە سەرتای دەربڕینی ووشەکە ، واتە لە کاتی گەیاندنی ناخوێندرێتەوە و نامێنێ ، بەلاّم ئەگەر لە سەرەتاوە دەستت پێکرد دەخوێندرێتەوە و جێگیر دەبێت بە ( همزة ).

## بەشەكانی هەمزەی گەیاندن لە دەستپێك دا




**یەكەم/ هەمزەی گەیاندن دەچێتە سەر كردار( فعل ) لەمانەی خوارەوە:-**

**١- كاری ڕابردوو لە پێنج ( ٥ ) پیتی ( الفعل الماضی الخماسيُّ ) ،**

**وەك :** ﴿ٱعۡتَدَىٰ﴾ البقرة: ١٧٨ ،﴿ٱقۡتَرَبَتِ﴾ القمر: ١ ،﴿ٱشۡتَرَىٰ﴾ التوبة : ١١١.

**٢- كاری ڕابردوو لە شەش پیتی ( الفعل الماضی السُّداسيُّ ) ،**

**وەك :** ﴿ٱسۡتَسۡقَىٰ﴾ البقرة: ٦٠، ﴿ٱسۡتَكۡبَرَ﴾ ص: ٧٤.

**٣- كرداری داخوازی لە سێ پیتی ( الامر مِن الفعل الثلاثيُّ ) ،**

**وەك :** ﴿ٱضۡرِب﴾ البقرة: ٦٠ ،﴿ٱنظُرۡ﴾ النساء: ٥٠ ،﴿ٱدۡعُ﴾ النحل: ١٢٥.

**٤- كرداری داخوازی لە پێنج پیتی ( الامر مِن الفعل الخماسيُّ ) ،**

**وەك :** ﴿ٱنتَهَوۡاْ﴾ البقرة: ١٩٢ ، ﴿ٱنطَلِقُوٓاْ﴾ المرسلات: ٢٩ .

**٥- كرداری داخوازی لە شەش پیتی ( الامر مِن الفعل السُّداسيُّ ) ،**

**وەك :** ﴿ٱسۡتَغۡفِرۡ﴾ التوبة: ٨٠ ، ﴿ٱسۡتَـٔۡجِرۡهُ﴾ القصص: ٢٦.

## جووڵەی هەمزەی گەیاندن

### لە دەستپێکی کردار ( الفعل )

١- هەمزەی گەیاندن ( ضمة ) وەردەگرێت لە دەستپێکی کردار ( فعل ) ئەگەر پیتی سێیەمی ووشەکە (ضمة) بوو بەڵام تووش هاتوو نەبوو (عارض )[1] بەڵکو پەیوەست بوو ( لازما ).

وەك : ﴿ ٱنظُرۡ ﴾النساء: ٥٠ ، ﴿ ٱرۡكُضۡ ﴾ص: ٤٢ ، ﴿ ٱدۡعُ ﴾النحل: ١٢٥ ، ﴿ٱجۡتُثَّتۡ ﴾إبراهيم: ٢٦.

٢- هەمزەی گەیاندن ( كسرة ) وەردەگرێت لە دەستپێکی کار ( الفعل ) ئەگەر پیتی سێیەم :

- ( كسرة ) بێت ، وەك : ﴿ ٱكۡشِفۡ ﴾الدخان: ١٢ .

- ( فتحة ) بێت ، وەك : ﴿ وَٱسۡتَغۡفِرۡ ﴾آل عمران: ١٥٩ ، ﴿ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ﴾ البقرة: ٢٧٨.

---

[1] ئەگەر هاتوو ( ضمة ) کە ( عارض ) بوو هەمزەی گەیاندن لە دەست پێکردن بە (كسرة) دەخوێندرێتەوە

– ئەگەر پیتی سێیەم ( ضمة ) یەکی ( عارض ) بێت.

وەك: ﴿ ٱمۡشُواْ ﴾[1] ص: ٦، ﴿ ٱبۡنُواْ ﴾ الكهف: ٢١ ، ﴿ ٱئۡتُواْ ﴾ الجاثية: ٢٥ ،

﴿ ٱقۡضُوٓاْ ﴾ يونس: ٧١ ، ﴿ وَٱمۡضُواْ ﴾ الحجر: ٦٥.

## دووەم/ هەمزەی گەیاندن لە ناو( اسم ) ( همزة الوصل في الاسماء )

هەمزەی گەیاندن بچێتە سەر (ناو،(اسم) دوو جۆرە،(قیاسیة – سماعیة):

لە رووی پێوەرەوە ( قیاسي ) بریتی یە لەمانەی خوارەوە:–

أ–سەرچاوەی کردار ( مصدرالفعل ) لە پێنج پیتی ( فعلِ الخُماسي )

وەك :﴿ ٱنتِقَامٍ ﴾ آل عمران: ٤، ﴿ ٱخۡتِلَٰفِ ﴾ يونس: ٦ ،

﴿ ٱخۡتِلَٰفُ ﴾ المؤمنون: ٨٠ ،﴿ ٱبۡتِغَآءَ ﴾ البقرة: ٢٠٧ .

ب– سەرچاوەی کردار ( مصدرالفعل ) لە شەش پیتی ( فعلُ السُداسِي )

وەك :﴿ ٱسۡتِغۡفَارُ ﴾ التوبة: ١١٤ ، ﴿ ٱسۡتِعۡجَالَهُم ﴾ يونس: ١١ ،

﴿ ٱسۡتِكۡبَارًا ﴾ فاطر: ٤٣ ، نوح: ٧ .

---

[1]) هۆکاری خوێندنەوەی بە ( کسرة ) لە بنچینەدا پیتی سێیەمی ئەم ووشانە ( کسرة ) بووە ، بۆ نموونە: ﴿ٱمۡشُواْ﴾ لە بنچینەدا بەم شێوەیە بووە: ( امشِيُواْ ) پاشان گوازراوەتەوە ( ضمة )ی یائەکەی بۆ پیتی ( شین ) و پاش لابردنی جووڵەی پیتی ( شین ) ، لە دوای ئەم دوو پیتە ( ساکن ) ـەکە بەیەك دەگەن ( یاء ، واو ) پاشان نامێنێت ، پیتی ( یاء ) لەبەر رزگاربوونی لە بەیەك گەیشتنی دوو پیتی ( ساکن ).

**لە رووی بیستراوەوە ( السماعية ) لە قورئانی پیرۆز تەنها لە حەوت (٧) ووشە هاتووە :-**

١- ( ٱبن ) وەك : ﴿إِنَّ ٱبۡنِي مِنۡ أَهۡلِي﴾ هود: ٤٥.

٢- ( ٱبۡنَتَ ) جیاوازی نی یە تاك بێت، وەك : ﴿وَمَرۡيَمَ ٱبۡنَتَ عِمۡرَٰنَ﴾ التحريم: ١٢

یان دووانە بێت ، وەك : ﴿إِحۡدَى ٱبۡنَتَيَّ﴾ القصص: ٢٧ .

٣- ( ٱمۡرُؤٌاْ )[1] جیاوازی نی یە (مرفوع) بێت وەك: ﴿إِنِ ٱمۡرُؤٌاْ هَلَكَ﴾ النساء: ١٧٦

یان ( منصوب ) وەك : ﴿مَا كَانَ أَبُوكِ ٱمۡرَأَ سَوۡءٖ﴾ مريم: ٢٨،

یان ( مجرور ) وەك : ﴿كُلُّ ٱمۡرِيِٕۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٞ﴾ الطور: ٢١.

٤- ( ٱثنين ) جیاوازی نی یە ( مرفوع ) بێت وەك :

﴿ٱثۡنَانِ ذَوَا عَدۡلٖ﴾ المائدة: ١٠، یان ( منصوب ) وەك :

﴿وَقَالَ ٱللَّهُ لَا تَتَّخِذُوٓاْ إِلَٰهَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِۖ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ﴾ النحل: ٥١ .

٥- (ٱمۡرَأَةٌ) جیاوازی نی یە (مفرد) بێت وەك: ﴿وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ﴾ النساء: ١٢٨

یان ( مثنى ) وەك : ﴿وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ ٱمۡرَأَتَيۡنِ تَذُودَانِۖ﴾ القصص: ٢٣.

---

[1] ) لەم ووشەیە پیتی ( راء ) وەك جوولەی دوای خۆی دەبێت ( أي حركة الإعراب ) وە لە دەستپێكردنیشی بە ( كسرة ) دەبێت.

٦-( ٱسم ) وەك : ﴿ يَأْتِي مِنۢ بَعْدِي ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ ﴾ الصف: ٦.

٧-( ٱثنين ) جیاوازی نی یە ( مرفوع ) بێت وەك :

﴿ فَٱنفَجَرَتْ مِنْهُ ٱثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا ﴾ البقرة: ٦٠ ،

یان ( منصوب ) وەك : ﴿ فَإِن كَانَتَا ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ ﴾ النساء: ١٧٦.

## جووڵەی هەمزەی گەیاندن لە دەستپێکی ناو( اسم )

هەمزەی گەیاندن بەردەوام بە ( کسرة ) دەخوێندرێتەوە لە ناوەکان (الاسماء)

تێبینی: لە ووشەی پیرۆزی خوای گەورە : ﴿ بِئْسَ ٱلِاسْمُ ﴾ الحجرات: ١١

دروستە بۆ قورئان خوێن لە دەست پێ کردن بەم ووشەیە: ﴿ ٱلِاسْمُ ﴾ بە دوو شێوە بخوێنێتەوە:-

١- دەست پێ کردن بە هەمزەی گەیاندن بە ( فتحة ) ، وە خوێندنەوەی پیتی ( لام )ـەکەش بە ( کسرة ).

بەم شێوەیە: ﴿ أَلِسْمُ ﴾.

٢- دەست پێ کردن بە پیتی ( لام ) بە ( کسرة ) بەبێ هەمزەی گەیاندن.

بەم شێوەیە: ﴿ لِسْمُ ﴾.

## سێیەم/ هەمزەی گەیاندن لە پیت ( همزة الوصل في الحرف )

هەمزەی گەیاندن دەچێتە سەر یەك پیت کە بریتی یە لە لامی پێناساندن ( لام التعریف ) وە بەردەوام بە (فتحة) دەخوێندرێتەوە لە دەست پێکدا، وەك : ﴿ ٱللَّهُ ﴾الإخلاص: ١، ﴿ ٱلرَّحْمَٰنُ ﴾الرحمن: ١، ﴿ ٱلرَّحِيمُ ﴾ الطور: ٢٨.

تێبینی/هەمزەی گەیاندن نامێنێ لە نوسین و خوێندنەوە (لفظاً وخطاً)

لە (أل)ـی پێناساندن ئەگەر چووە سەر لامی (الجرِّ) وەك: ﴿ لِلْمُتَّقِينَ ﴾البقرة:٢

## هەمزەی پچڕاو - پچڕێنەر - ( همزة القطع )

بریتی یە لەو هەمزەیەی کە لە دەستپێکی گەیاندن و وەستان دەردەبڕدرێت ،

وەك : ﴿ أَتَىٰ ﴾ النحل: ١ ، وە هاوشێوەکانی ﴿ يُؤْمِنُونَ ﴾ البقرة: ٣ ، وە هاوشێوەکانی ﴿ يَشَآءُ ﴾البقرة: ٩٠ ، هاوشێوەکانی

هەمزەی پچڕاو لە ((ناو) ( اسم ) ، کردار ( فعل )، پیت ( اسم ) ) دێت ، وە بە هەر سێ جۆرە جووڵەکانیەوە لە سەرەتای ووشەکان ، وە بە ( ساکن ، متحرك ) دێت لە ناوەڕاست و کۆتایی ووشە.

## شێوەی هەمزەی پچڕاو ( صورُ همزةِ القَطع )

١-لە سەرەتای ووشە دێت ، دەنوسرێت لەسەر ( ألِف ) بە تەواوی (مطلقاَ) یەکسانە بە ( فتحة ، ضمة ، کسرة ) ،

وەك :

﴿ أَبْصِرْ ﴾ الكهف: ٢٦ ، ﴿ إِخْرَاجٍ ﴾البقرة: ٢٤٠ ، ﴿ أُعِيذُهَا ﴾ آل عمران: ٣٦ ،

وە بە هەمان شێوە ئەگەر پیتێکی زیاد پێی بگات ، وەك :

﴿ سَأَصْرِفُ ﴾ الأعراف: ١٤٦.

٢- هەمزەی پچڕاو لە ناوەڕاستی ووشە دێت یا بە ( ساكن ) یان بە بزواو ( متحرك ) :

أ- هەمزەی ساكن : ئەگەر لە پێش بزواو ( متحرك ) بێت ، دەنوسرێت لەسەر پیتەكە لە رەگەزی پێش خۆی وەك ئەمانەی خوارەوە:

❖ ئەگەر پێشی ( فتحة ) بێت ، دەنوسرێ لەسەر پیتی ( أَلِف ) ، وەك :

﴿أَنشَأْتُمْ﴾ الواقعة: ٧٢.

❖ ئەگەر پێشی ( كسرة ) بێت ، دەنوسرێ لەسەر پیتی ( یاء ) ، وەك :

﴿جِئْتُمْ﴾ یونس: ٨١ ، مریم: ٨٩.

❖ ئەگەر پێشی ( ضمة ) بێت ، دەنوسرێ لەسەر پیتی ( واو ) ، وەك :

﴿وَٱلْمُؤْمِنُونَ﴾ البقرة: ٢٨٥

ب-هەمزەی بزواو ( متحرك ) لە ناوەڕاستی ووشە: ئەگەر پێش ( همزة ) كە(ساكن) بێت،دەنوسرێت لەسەر پیتی هەمزە لەرەگەزی جووڵەی پێش خۆی بە یەكسان ئەگەر ( الساكن صحیحاً ) یا پیتەكە ( عِلَّة ) بێت، وەك:

﴿نِسَآءَكُمْ﴾ البقرة: ٤٩ ، ﴿قَآئِمَةٌ﴾ آل عمران: ١١٣ ، ﴿هَآؤُمُ﴾ الحاقة: ١٩ .

ج-ئەگەر هەمزەكە خۆی ( كسرة ) بێت ( فتحة ، ضمة ، كسرة )ی لە پێشی دێت و دەنوسرێت لەسەر پیتی ( یاء ) ، وەك :

﴿يَئِسُواْ﴾ العنكبوت: ٢٣، الممتحنة: ١٣، ﴿سُئِلَتْ﴾ التكویر: ٨ ، ﴿بَارِئِكُمْ﴾ البقرة: ٥٤.

# بەراوردێك لە نێوان هەمزەی گەیاندن و پچڕاو بە چەند خاڵێك

| هەمزەی گەیاندن ( الوصل ) | هەمزەی پچڕاو ( القطع ) |
|---|---|
| ناخوێندرێتەوە لە کاتی گەیاندن | جێگیرە و دەخوێندرێتەوە لە کاتی وەستان و گەیاندن. |
| تەنها لە سەرەتای ووشە دێت. | لە سەرەتاو ناوەڕاست و کۆتایی ووشە دێت. |
| هیچ کات بە ( ساکن ) نایێت. | بە ( ساکن ) دێت. |
| لە سەر( الف )ەکە وێنەی (صاد) ێکی بچووك کراوە وەرگیراوە لەم ووشەیە بە گەیاندن. | وێنەی هەمزە ( ء ) وەك شێوەی سەری پیتی ( عین ) وایە وە لەسەر پیتی ( الف ، واو ، یاء ) دەنوسرێ و دەخوێندرێتەوە. |
| هیچ کات نایەت لەگەڵ کرداری رانەبردوو لە چوار پیتی ( مطلقاً ) بە تەواوی. | لەگەڵ کرداری رانەبردوو چوار پیتی دێت. |
| هیچ کات نایەت بە شێوەی پرسیار | هەمزەی پرسیار بریتیە لە پچڕاوی بە ( فتحة ). |

## کۆبوونەوەی هەمزەی گەیاندن و پچڕاو

## ( اجتماع همزتي الوصل والقطع )

پێشکەوتنی هەمزەی گەیاندن لەسەر هەمزەی ( ساکن )ی پچڕاو ، بەم شێوەیە نایەت تەنها لە کردار نەبێت ،

وەك: ﴿ اؤْتُمِنَ ﴾ البقرة: ٢٨٣ ، ﴿ ائْتُونِي ﴾ يونس: ٧٩ لەگەڵ شوێنەکانی تریش ،

﴿ ائْتِ ﴾ يونس: ١٥ ، الشعراء: ١٠ ،

لە کاتی دەست پێ کردن بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت:

❖ لە دەست پێ کردنی هەمزەی گەیاندن بە پێی ریزبەندی جووڵەی کردار (فعل) سێیەمی پیتەکە دەبێت، لە دەستپێکردن کردار ( فعل )ی ﴿ اؤْتُمِنَ ﴾ بە ( ضمة ) دەست پێدەکرێت ، چونکە پیتی سێیەم ( ضمة ) یەکی بنەڕەتی ( أصلي ) یە لە کرداری ( فعل )ی ئەم ووشەیەش ﴿ ائْتُونِي ﴾ لە دەستپێکا بە ( کسرة ) دەخوێندرێتەوە ، چونکە پیتی سێیەم (ضمة) کەی تووش هاتووە (عارض)ـە ، لە کردار (فعل)ی ووشەی سێیەم ﴿ ائْتِ ﴾ لە دەستپێکا بە (کسرة) دەخوێندرێتەوە ، چونکە پیتی سێیەم ( کسرة ) یە.

❖ پاش ئەوەی کارامە و شارەزا بووین لە جووڵەی هەمزەی گەیاندن بۆ مان دەردە کەوێت یەکێك لە بنچینەی بناغەکانی عەرەب کە دەگوترێ : دوو هەمزە لە نێوان یەکتر کۆنابنەوە کە دووەمیان ( ساکن ) بێت، ئەگەر دامەزراو بوو لەسەر شێوەی کردار ( فعل ) ، وەك : ﴿ أَؤْتُمِنَ ﴾ ئەوە ئێمە وەری دەگێڕین بۆ واوی بچووك لە سەرەتای کردار ( فعل ) بەم شێوەیە ، ( أُوتُمِنِ ) لە هەردوو کردار ( فعل )ـەکەی تر بە ( یاء ) دەست پێدەکرێت بەم شێوەیە : ﴿ ءِیتُونِي ﴾ ﴿ ءِیتِ ﴾ .

## پێشکەوتنی هەمزەی پچڕاو بۆ پرسیار لەسەر هەمزەی گەیاندن

دوو جۆری هەیە : –

١– ئەگەر هەمزەی پچڕاو پێش کەوت لەسەر هەمزەی گەیاندن لە کردار ئەوە هەمزەی گەیاندن نانوسرێت و ناخوێندرێتەوە.

وەك لەم خشتەیە دەردەکەوێت :–

| نموونە لە بنچینەدا | نووسین و خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز |
|---|---|
| ﴿ أَاتَّخَذْتُمْ ﴾ | ﴿ أَتَّخَذْتُمْ ﴾ البقرة: ٨٠ |
| ﴿ أَاطَّلَعَ ﴾ | ﴿ أَطَّلَعَ ﴾ مريم: ٧٨ |
| ﴿ أَاصْطَفَى ﴾ | ﴿ أَصْطَفَى ﴾ الصافات : ١٥٣ |
| ﴿ أَافْتَرَى ﴾ | ﴿ أَفْتَرَىٰ ﴾ سبأ: ٨ |
| ﴿ أَاسْتَكْبَرْتَ ﴾ | ﴿ أَسْتَكْبَرْتَ ﴾ ص: ٧٥ |
| ﴿ أَاسْتَغْفَرْتَ ﴾ | ﴿ أَسْتَغْفَرْتَ ﴾ المنافقون: ٦ |
| ﴿ أَاتَّخَذْنَاهُمْ ﴾ | ﴿ أَتَّخَذْنَٰهُمْ ﴾ ص: ٦٣ |

١– ئەگەر هاتوو هەمزەی پچڕاو پێش هەمزەی گەیاندن کەوت لە (ألـ)ی ناساندن ، ئەوە عەرەب کار دەکات بە پێچەوانەی بناغەی گشتی لە هەمزەی گەیاندن، بە دوو رێگا:

أ – گۆڕین ( الإبدال )　　　ب– ئاسانکراو ( التسهيل )

❖ گۆڕین ( الإبدال ) : گۆڕینی هەمزەی گەیاندن بە پیتی ( المدّ ) لەم کاتەدا ( مَدُّ اللازم ) دروست دەبێت بە ئەندازەی شەش ( ٦ ) جوولە (حركة) درێژدەکرێتەوە ، ئەمەش لە قورئانی پیرۆز لە سیٚ ووشە و لە شەش ( ٦ ) شوێندا هاتووە کەبریتین لە :

﴿ ءَآلذَّكَرَيْنِ ﴾ الأنعام: ١٤٣- الأنعام: ١٤٤، ﴿ ءَآلْـَٰٔنَ ﴾ يونس: ٥١ - يونس: ٩١،

﴿ ءَآللَّهُ ﴾ يونس: ٥٩ - النمل: ٥٩.

❖ ئاسانکراو ( التسهيل ) : بریتی یە لە دەربڕینی هەمزەی ئاسانکراو لە نێوان هەمزەیەکی ئاشکراو پیتی ( المدّ )ی هاوڕەگەزی لە جوولە (حركة) کەی پێش خۆی ، بە شێوەیەك هەمزەی ئاسانکراو ( التسهيل ) دەردەچێت لە نێوان هەمزە و پیتی ( ألِف )، وەك جۆری دووەمی خوێندنەوەی ئەم سیٚ ووشەیەی خاڵی یەکەم. ئەگەر گوێبیستی (خەتمە)کەی شێخ ( محمد صديق المنشاوي ) ببین زۆر بە جوانی ئەم سیٚ ( ٣ ) ووشەیە کە لە شەش ( ٦ ) شوێن هاتووە لە قورئانی پیرۆز بە ئاسانکراو ( التسهيل ) دەخوێنێتەوە ، بەڵام گۆڕین ( الإبدال ) لە پێشترە لە جیٚ بە جیٚ کردن لەم سیٚ ووشەیە وە.

وە هەروەهاپەیوەندیەك دەكات بە سوڕەتی ( الروم – ٥٤ ) لە سیٚ ( ٣ ) شوێنەکەی : ﴿ ضَعْفٍ ﴾ ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ﴾ الروم: ٥٤

کە ( فتحة ) لە پێشترە لە جیٚ بە جیٚ کردن لەم سیٚ ووشەیە ، بەڵام ئەو بە ( ضمة ) دەخوێنێتەوە ٠

## تێبینی/

تاكە شوێن لە قورئانی پیرۆز كە دوو پیتی ( همزة ) بەیەك دەگەن لە ڕیوایەتی ( حفص ) بە ئاسانكراو (التسهيل) دەخوێندرێتەوە هەمزەی دووەم ، وەك : ﴿ ءَاْعْجَمِيٌّ وَعَرَبِيٌّ ﴾ فصلت: ٤٤

## دەستپێك و روونكردنەوەی وەستان و دەستپێكردن

بەراستی خوای پەروەردگار خۆی پارێزگاری لە قورئانی پیرۆز دەكات لە هەموو شێوەكانی ، وە زۆر لە زانا دڵسۆزەكان لە هەموو جۆرە زانستەكانی پارێزگاری لێ دەكەن ، وەك : زانستی ( الرسم العثماني )[1] و (النحو والصرف) وە راوەستان و دەستپێكردن ( الوقف والإبتداء ) وە بە پاراستنی دەق ( النص ) دەقی قورئانی لە هەموو گۆڕانكاریەك و گۆڕینی مانایەك لە مانا پیرۆزەكانی قورئان یان گۆڕینی ڕستە و دەستەواژەیەك ، وە زانستی وەستان و دەستپێكردن ( الوقف والإبتداء ) لە خوێندنەوەی قورئان لە زۆرترین ئەو زانستانەیە كە زانایان گرینگی یەكی زۆریان پێداوە ، تا گەیشتۆتە ئەو ڕادەیەی هەندێك زانا ئەم زانستەیان بە پێویست (واجب) داناوە ، وەك لە ئیمامی عەلی ڕیوایەت كراوە ( رەزای خوای لێ بێت ) كاتێك پرسیاری لێكرا لە فەرموودەی خوای پەروەردگار ﴿ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ﴾ المزمل: ٤ ، فەرمووی : ﴿ ترتيل ﴾ بریتی یە لە جوان دەربڕینی پیتەكان و زانینی وەستان لە كاتی خوێندنەوەی قورئان .

---

[1]) وێنە ( الرسم ) ئەو شێوازانەی كە قورئانی پێ نووسراوەتەوە وەك : ﴿ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ المائدة: ٩١ (واو)ـەكە ناخوێندرێتەوە بەڵام لە وێنەو نووسین وەك خۆی دەردەكەوێت ، بەم شێوەیەی كە نووسەرانی سروش ( الوحي ) لە پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) وەریان گرتووەو نووسیویانەتەوە لە كاتی دابەزینی ( الوحي ) كە رای زۆربەی زانایانی لەسەرە سەبارەت بە نووسینەوەی ( مصحف ) كەوا ( توقيفي )یە.
( العثماني ) خستنەپاڵ ئیمامی عوسمانە (رەزای خوای لێ بێت ) ، چونكە شێوەی لەبەرگرتنەوەی ئەو پێی هەڵساوە.

هەروەها عبدالله كوڕی عومەر( ڕەزای خوا لە خۆی و باوكی بێت ) دەفەرموێ : بەڕاستی ئێمە ماوەیەكی زۆر ژیاین ، یەكێك لە ئێمە باوەڕی دەهێنا پێش وەرگرتنی قورئان كە سوڕەتێك دادەبەزیێ بۆ سەر دڵی پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) فێری حەلاڵ و حەرام و فەرمانەكان و قەدەغە كراوەكان دەبووین ، وە ئەوەش كە تیایدا پێویست دەبوو بوەستێ هەڵوەستەی دەكرد و دەوەستا لە كاتی خوێندنەوەی قورئان.[1]

## ڕوونكردنەوە:

( ابن الجزري ) لە كتێبی ( النشر ) وەك ئاماژەیەك بەم ووتەیە ، لە ووتەی ئیمامی عەلی (ڕەزای خوای لێ بێت) دیارە كەوا بەڵگەیە لە سەر ئەوەی زانین و فێربوونی وەستان و دەستپێكردن ( الوقف والإبتداء ) پێویستە (واجب)ە.

وە لە ووتەكەی عبدالله كوڕی عومەر (ڕەزای خوا لە خۆی و باوكی بێت)، ڕێنیشاندەر و بەڵگەیە لەسەرئەوەی كە هەموو هاوەڵەكان بەم زانستەیان زانیوە و خۆیان لێ فێركردووە .

---

[1] ( طبراني ) ريوايەتی كرددوە.

## وەستان ( الوقف )

لە فەرموودەی پێغەمبەری خوا هاتووە ، کەوا دوو پیاو هاتنە لای پێغەمبەر ( صلی الله علیە وسلم ) یەکیان شایەتی داو ووتی هەرکەسێ فەرمانبەرداری و گوێڕایەلی خواو پێغەمبەر ( صلی الله علیە وسلم ) بکات ، بەڕاستی ئەوە سەربەرزو سەرکەووتوە وە هەرکەسیش گوێڕایەڵیان نەکا ، پاشان راوەستا لە ووتەکەی.

پێغەمبەر ( صلی الله علیە وسلم ) پێی فەرموو : هەڵسە تۆ خراپترین ووتاربێژی ، بڵێ هەرکەسیش گوێڕایەڵی نەکا بەڕاستی گومڕایە و سەرگەردانە [1].

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیەکی روون و ئاشکرایە لەسەر ناپەسەندی ( کراهة )ی وەستان لەو شوێنانەی کە ووشەیەك پەیوەندی بە ووشەکەی دوای خۆی هەیە ، ماناکەی بە ووشەکەی تر تەواو دەبێ ، خوێنەر نابێت بوەستێت ، چونکە مانای رستەکە دەگۆڕێ.

دایکی سەلەمە ( رەزای خوای لێ بێت ) فەرمووی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم ) خوێندنەوەکەی دەپچڕاند دەیفەرموو : ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ پاشان دەوەستا بە هەناسە ئینجا ﴿ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ ی دەخوێند، پاشان دەوەستا بە هەناسە ئینجا ﴿ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴾ ی دەخوێند.

ئیمامی دانی ( رەحمەتی خوای لێ بێت ) دەفەرموێ : بۆ ئەم فەرموودەیە رێگای زۆر هەیە.

---

[1] ) ئیمامی احمد لە موسندەکەی ومسلم لە صەحیحەکەی ریوایەتیان کردووە.

# پێناسەی وەستان ( الوقف )

**له زمانەوانیدا:**

وەستان ـ ڕاوەستان ـ بە پێچەوانەی دانیشتن ، وەهەروەها ئیمامی ( الأشموني ) (ڕەحمەتی خوای لیٚ بێت) دەفەرموێت : وەستان بریتی یە لە دەست هەڵگرتن و وازهێنان لە ووتە و کردار.

**له زاراوەدا:**

پچڕانی دەنگە لەسەر کۆتایی ووشەیەکی قورئانی پیرۆز لەگەڵ هەناسەدان و پشوودان بە نیازو مەبەستی دەستپێکردنەوەی قورئان خوێندن ، بەڵام بە مەرجێك ئەم شوێنەی کە خوێنەردەست پێدەکات گونجاو و ڕێك بێت لە رووی واتاوە.

## تێبینی /

أ – وەستان لە ناوەڕاستی ووشەدا نابێت ، کە ووشەکە بەیەکەوە وێنەکێش کرابێت. وەك وەستان لەسەر :

- ( مِن ) لە فەرمایشتی خوای پەروەردگار :

﴿ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴾البقرة: ٣.

- ( ياء ) لە فەرمایشتی خوای پەروەردگار :

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾البقرة: ١٠٤.

- ( هاء ) لە فەرمایشتی خوای پەروەردگار :

﴿هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ ﴾الإسراء: ٢٠.

ب –حوکمی وەستان : دروستە لە کاتێکدا هیچ هۆکارێك نەبێت کە واجبی بکات ، یان هیچ پاڵنەرێك نەبێ کە قەدەغەی بکات ، هەروەك ( ابن الجزري ) ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) ئاماژەی پێ کردووە دەفەرموێ:

وَلَيسَ فِي القرآن مِنْ وَقْفٍ وَجَبْ      ولا حَــرامٌ غيرُ مــا لَـهُ سَبَبْ

واتە : لە قورئاندا هیچ شوێنێك نیە وەستان واجب بێت

قەدەغەش نەکراوە ، مەگەر هۆکارێکی هەبێت.

## خشتەی جۆرەکانی وەستان ( أَنْوَاعُ الوَقْفِ )




( ابن الجزري ) ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) دەفەرموێ :

وَبَعْدَ تَجْوِيْدِكَ لِلْحُرُوفِ      لاَبُدَّ مِنْ مَعْـرِفَةِ الْوُقُـوفِ

واتــە:پاش شارەزابوونت لەسیفەت و ڕەوان دەربڕینی پیتەکان

ئەوا پێویستە لێزان وشارەزابیت لە زانینی وەستان ودەست پێ کردن·

# جۆرەکـانی وەستان ( أَنْوَاعُ الوَقْفِ )

## وەستانی تاقی کردنەوە ( الوقف الاختباري ) :-

بریتی یە لە وەستان لەسەر ووشەیەك کە شوێنی وەستان نی یە ، بەڵکو بەمەبەستی تاقی کردنەوە یان فێربوون ماموٚستا داوا لە قوتابی دەکات لەسەری بوەستێت. وەك ئەم ووشانە: ﴿ لَّٰكِنَّا۠ ﴾الكهف: ٣٨ ،﴿ ءَاتَىٰنِۦَ ﴾النمل: ٣٦

## وەستانی ناچاری ( الوقف الاضطراري ):-

بریتی یە لە وەستان لەسەر ووشەیەك بە هۆی هەناسەنەمان یان پشمین یاخود هەر شتێك کە لە دەسەلاٚتی قورئان خوێن دا نەبێت.

## وەستانی چاوەڕوانی ( الوقف الانتظاري ) :-

بریتی یە لە وەستان لەسەر ووشەیەك بۆ دیاریکردنی شێوەی یاخود جۆری خوێندنەوەکە وەك وەستان لەسەر ووشەی: ﴿ وَٱلْأَٰخِرَةِۚ ﴾النساء : ١٣٤

## وەستانی چاودێری ( وقف المراقبة ) :-

بریتی یە لە کۆبوونەوەی دوو وەستان لە یەك شوێن ، لەم حاڵەتەش ئەتوانی لەسەر هەر کامەیان بێ بوەستی ، بەلاٚم بە مەرجێك ئەگەر لەسەر یەکێکیان وەستای نابێ لەسەر ئەوەی تریان بوەستی ئەمەش بۆ ئەوەیە تاکو مانای تێك نەچێت ، وەهەروەها ئەم جۆرە وەستانە پێی دەوترێت وەستانی لە باوەشنان یاخود تێك هەڵکێشراو ( **تعانُق** ).

وەك : ﴿ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَۛ فِيهِۛ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ﴾البقرة:٢ ،

﴿ قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيْهِمْۛ أَرْبَعِينَ سَنَةًۛ يَتِيهُونَ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾المائدة:٢٦ ،

﴿ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِأَفْوَٰهِهِمْ وَلَمْ تُؤْمِن قُلُوبُهُمْۛ وَمِنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ۛ ﴾ المائدة: ٤١.

## وەستانی ناڕەوا ( الوقف التعسفي ) :-

بریتی یە لەو جۆرە وەستانە ناڕەوایەی کە هەندێ لە شیکەرەوەکان دەیکەن یاخود هەندێ لە قورئان خوێنان هەندێ جار تووشی ئەبن ئەویش ئەوەیە کە ووشەیەك دەکەن بە دوو بەشەوە و لەناوە ڕاستی دا (وقف) دەکەن ، ئەم جۆرە وەستانە نابێ بە ئەنقەست ئەنجام بدرێت ، بەڵکو دەبێت لەو شوێنە بوەستێ کە شیاوترین واتا دەبەخشێ یاخود باشترین شوێنە بۆ وەستان ، بۆ بەر چاو ڕوونی چەند نمونەیەك لە وەستانی ناڕەوا دەهێنینەوە :

- وەستان لەسەر ووشەی : ﴿أَمْ لَمْ تُنْذِرْ﴾ ودەست پێکردن بە : ﴿هُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾
- وەستان لەسەر ووشەی : ﴿فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ﴾ ودەست پێکردن بە: ﴿عَلَيْهِ أَنْ يَطَّوَّفَ بِهِمَا﴾ البقرة: ١٥٨
- وەستان لەسەر ووشەی : ﴿ثُمَّ جَاءُوكَ يَحْلِفُونَ﴾ ودەست پێکردن بە : ﴿بِاللَّهِ إِنْ أَرَدْنَا إِلَّا إِحْسَانًا وَتَوْفِيقًا﴾ النساء: ٦٢
- وەستان لەسەر ووشەی : ﴿وَهُوَ اللَّهُ فِي السَّمَاوَاتِ﴾ و دەست پێکردن بە: ﴿وَفِي الْأَرْضِ يَعْلَمُ سِرَّكُمْ وَجَهْرَكُمْ وَيَعْلَمُ مَا تَكْسِبُونَ﴾ الأنعام: ٣
- وەستان لەسەرووشەی: ﴿وَهُوَ يَعِظُهُ يَا بُنَيَّ لَا تُشْرِكْ﴾ ودەست پێکردن بە: ﴿بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾ لقمان: ١٣

❖ وەستان لەسەر ووشەی : ﴿ عَيۡنٗا فِيهَا تُسَمَّىٰ سَلۡسَبِيلٗا ﴾ ودەست پێکردن بە :

﴿ سَلۡسَبِيلٗا ﴾ الإنسان : ١٨

❖ وەستان لەسەر: ﴿ ثَمَّ ﴾ لە ئایەتی: ﴿ وَإِذَا رَأَيۡتَ ثَمَّ ﴾ ودەست پێکردن بە:

﴿ رَأَيۡتَ نَعِيمٗا وَمُلۡكٗا كَبِيرًا ﴾ الإنسان: ٢٠

## وەستانی هەڵبژاردەیی ( الوقف الاختياري ) :-

بریتیی یە لە وەستان لەسەر ووشەیەکی هەڵبژاردراو ، وە ئەم جۆرە پەیوەندی بە یاساکانی( احکام )ی وەستان هەیە.

## بەشەکانی وەستانی هەڵبژاردەیی

**وەستانی تەواو ( الوقف التام )**: بریتی یە لە وەستان لەسەر ووشەیەك کە ماناکەی تەواو بێت لەڕووی (إعراب) و ( واتاوە ) بە تەواو ناسراوە لەبەر ئەوەی ڕستەکە یاخود ووشەکە واتای تەواوە و پێویستی بە ووشەی دوای خۆی نی یە بۆ تەواوکردنی ماناکەی ، یاخود (إعراب)ەکەی . وەك وەستان لەسەر ووشەی : ﴿ يَتَفَكَّرُواْ ﴾ تەنها لەسێ شوێن هاتووە لە قورئانی پیرۆز :

- ﴿ أَوَلَمۡ يَتَفَكَّرُواْۗ مَا بِصَاحِبِهِم مِّن جِنَّةٍۚ إِنۡ هُوَ إِلَّا نَذِيرٞ مُّبِينٌ ﴾ الأعراف : ١٨٤
- ﴿ أَوَلَمۡ يَتَفَكَّرُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۗ مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَآ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَأَجَلٖ مُّسَمّٗىۗ ﴾ الروم : ٨
- ﴿ أَن تَقُومُواْ لِلَّهِ مَثۡنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُواْۚ مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍۚ ﴾ سبا : ٤٦

ئەم سێ شوێنەلای پێشەوا ( الدّاني ) وەستانی تەواو ( تام )ـە :

هەروەها وەستان لەسەر ووشەی : ﴿ٱلْمُفْلِحُونَ﴾البقرة : ٥ ، تەواوە ، وە لە چەند بەشێك پێك دێت وەك وەستانی تەواوی رووت ( الوقف ،التام المطلق ) وە وەستانی روونی تەواو ( وقف البيان التام – اللازم )

روونكردنەوە / وەستانی تەواو لەم خاڵانە ی خوارەوە روون دەبێتەوە:

- لە كۆتایی ( إستعاذة ) وەستان تەواوە.
- لە كۆتایی ( بسملة ) وەستان تەواوە.
- لە كۆتایی هەموو سورەتێك وەستان تەواوە.
- لە كۆتایی هەموو چیرۆكە قورئانیەكان وەستان تەواوە.
- لە كۆتایی هەموو بڕگەیەكی رەحمەت كە لە بڕگەی سزا جیا بكاتەوە وەستان تەواوە.

وەك : وەستان لەسەر ووشەی ﴿فَضْلِهِۦ﴾ لە ئایەتی :﴿وَيَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضْلِهِۦ ۚ وَٱلْكَٰفِرُونَ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ﴾ الشورى: ٢٦

- لە كۆتایی هەموو ئایەتێك كە ئایەتی سزا لە رەحمەت جیابكاتەوە وەستانی تەواوە.

وەك: وەستان لە سەر ﴿أُعِدَّتْ لِلْكَٰفِرِينَ﴾ جیاكراو لە ئایەتی رەحمەت:

﴿وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾

**وەستانی تەواو – ڕەها ( الوقف التام المطلق ) :**

**پەیوەست بە دەربڕین ( التعلق اللفظي ) :**

واتا ئەو ووشەیەی لە دواوە دێت پەیوەندی بە ووشەکەی پێش خۆی هەبێت لەلایەنی شی کردنەوە (إعراب).

**پەیوەست بە واتا : ( هەڵواسراوی واتایی ) ( التعلق المعنوي ) :**

واتا ئەو ووشەیەی کە لە دواوە دێت پەیوەندی بە ووشەکەی پێش خۆی هەیە لەلایەنی واتاوە ، واتا پاش وەستان لەسەری و دوای دەست پێ کردن بە ووشەکەی دوای ئەو ، دەتوانی بیگەینی بە ووشەکەی دوای خۆی لەبەر ئەوەی بەگەیاندنی دوو ووشەکە بەیەکتر واتایەکە ناگۆڕێ.

وەك : گەیاندنی ووشەی: ﴿نَسۡتَعِينُ﴾ بە: ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾

**وەستانی ڕوونکەرەوەی تەواو: الوقف البيان التام ( اللازم )**

بریتی یە لە وەستان لەسەر ووشەیەك ، وە دەست پێ کردن بە ووشەکەی دوای ئەو ، چونکە ئەگەر یەك بگرن مانایە تەواوە کە نادات و واتاکەی دەگۆڕێت ، وەك وەستان لەسەر ئەم ووشانە:

- ﴿يَسۡمَعُونَ﴾ لەئایەتی :

﴿إِنَّمَا يَسۡتَجِيبُ ٱلَّذِينَ يَسۡمَعُونَ وَٱلۡمَوۡتَىٰ يَبۡعَثُهُمُ ٱللَّهُ ثُمَّ إِلَيۡهِ يُرۡجَعُونَ﴾ الأنعام: ٣٦.

- ﴿قَوۡلُهُمۡ﴾ لەئایەتی :

﴿فَلَا يَحۡزُنكَ قَوۡلُهُمۡ إِنَّا نَعۡلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعۡلِنُونَ﴾ يس: ٧٦.

- ﴿عَنۡهُمۡ﴾ لەئایەتی :

﴿فَتَوَلَّ عَنۡهُمۡ يَوۡمَ يَدۡعُ ٱلدَّاعِ إِلَىٰ شَيۡءٖ نُّكُرٍ﴾ القمر: ٦

## وەستانی تێر( بەس ) ( الوقف الكافي ) :

بێ دەنگ بوون لەسەر ووتەیەك كە مانایەكی تەواو دەبەخشێت ، وەهەروەها پەیوەندی بە ووشەی دوای خۆی هەیە لە رووی ماناوە نەك دەربڕینەوە ، وە پێی دەوترێت وەستانی تێر لەبەر ئەوەی ئەو بەتەنیا بەسسە ، وەهەروەها پێویستی بە دوای خۆی نی یە لەبەر ئەوەی بەپێش خۆیەوە نەبەستراوە تەوە لە رووی دەربڕینەوە (إعراب).

وەك وەستان لەسەر ئەم ووشانە:

﴿أَمۡرِهِۦۗ﴾ ﴿سَلَفَۚ﴾ ﴿مِنۡهُۗ﴾،

لە فەرمایشتی خوای گەورە :

﴿أَوۡ عَدۡلُ ذَٰلِكَ صِيَامٗا لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمۡرِهِۦۗ عَفَا ٱللَّهُ عَمَّا سَلَفَۚ وَمَنۡ عَادَ فَيَنتَقِمُ ٱللَّهُ مِنۡهُۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٞ ذُو ٱنتِقَامٍ﴾ المائدة : ٩٥

- وەستان لەسەر ووشەی : ﴿ٱلشَّيۡطَٰنِ﴾ لە فەرمایشتی خوای پەروەردگار :﴿وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِ﴾ البقرة: ١٦٨

وەستان لەم شوێنانە بنچینەیە بە ( الوقف الكافي ) لەلای پێشەوا (الدّاني)

وەك :

﴿وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ﴾ ﴿إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٌ﴾ البقرة : ٢٠٨

- ﴿فَقَٰتِلُوٓاْ أَوۡلِيَآءَ ٱلشَّيۡطَٰنِۖ﴾ – ﴿إِنَّ كَيۡدَ ٱلشَّيۡطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا﴾ النساء : ٧٦

• ﴿كُلُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ﴾ - ﴿إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾ الأنعام: ١٤٢

• ﴿قَالَ هَٰذَا مِنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۖ﴾ - ﴿إِنَّهُۥ عَدُوٌّ مُّضِلٌّ مُّبِينٌ﴾ القصص : ١٥

• ﴿أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا۟ ٱلشَّيْطَٰنَ ۖ﴾ ﴿إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾ يس : ٦٠

• ﴿وَلَا يَصُدَّنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ ۖ﴾ - ﴿إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾ الزخرف : ٦٢

## وەستانی ڕێك ( باش –چاك – جوان ): ( الوقف الحسن )

وەستان لەسەر ووشەیەك كە تەواوە لە خوودی خۆی بەڵام پەیوەندی بە دوای خۆی هەیە لە رووی دەربڕین و واتاوە وە پێی دەوترێت چاك (الحسن) ، چونكە بە وەستان لە سەر ئەم شوێنە مانایەكی ڕێك دەبەخشێت ، ئەم جۆرە زیاتر لە كۆتایی ئایەت دەبێت ، هەروەكو ( ابن الجزري ) دەفەرموێت : ( إلاَّ رُؤُوسَ الآيِ جَوِّزْ فَالْحَسَنْ )

- ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ الفاتحة: ٢ – ٣

-﴿فَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلدَّرَجَٰتُ ٱلْعُلَىٰ ۝٧٥ جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ﴾ طه: ٧٥ – ٧٦

- ﴿فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ۝٤ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ﴾ الماعون : ٤ – ٥

وەستان لە سەرووشەی :﴿لِّلْمُصَلِّينَ﴾ بەستراوە بە ڕستەكەی دوای خۆی بە شێوەیەكی زۆر بە هێز لە رووی ماناو دەربڕینەوە ، جا زانایان ڕای جیاوازیان هەیە دەربارەی وەستان لە سەری.

## حوكمی وەستان لە کۆتایی ئایەت

### رای زانایان لە سێ ڕێڕەودا کۆ دەکەینەوە:

**یەکەم:**

وەستان لەکۆتایی هەموو ئایەتێك، پاشان دەست پێ کردن بە ئایەتی دوای خۆی، بێ ڕەچاوکردنی بوون یان نەبوونی پەیوەندی دوو ئایەتەکە بە یەکتری یەوە یاخود بەهەڵە تێگەیشتن لە واتای ئایەت، بەڵگەی ئەمانیش فەرمودەی ئوموسەلەمەی دایکی ئیمانداران کەدەفەرموێت:(کاتێك پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەیخوێند خوێندنەوەکەی دەپچڕاند ئایەت بە ئایەت، دەیفەرمو: **الحمد لله رب العالمين** ، ڕادەوەستا ، پاشان دەیفەرمو: **الرحمن الرحيم**).

**دووەم:**

حوکمی وەستان لەکۆتایی ئایەتەکان وەك حوکمی وەستانە لە شوێنەکانی تر کە سەرە ئایەت نین، لە رووی وەستانەوە وەستانی تەواو( **تام** ) یان چاك (**الحسن**).

وەك: ﴿فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ۝٤ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ﴾ الماعون: ٤ - ٥ ،

واتە: ( سزا بۆ نوێژخوێنان . ئەوانەی لە نوێژە کانیان بێئاگان ) لێرەدا گەیاندن ( **وصل** ) کردن لەپێشترە لەبەر روونی پەیوەستی نێوان دوو ئایەتەکە.

## سێ یەم:

کۆکردنەوەیە لە میانی هەردوو ڕێڕەوی پێشوو ، بۆیە ئەگەر پەیوەندی یان هەبێ بە یەکترقورئان خوێن دەوەستێ لەکۆتایی ئایەتەکە پاشان دووبارە بەیەکەوە دەیان خوێنیتەوە ، وەك:

﴿ أَلَآ إِنَّهُم مِّنْ إِفْكِهِمْ لَيَقُولُونَ وەستان پاشان گەیاندن بەیەکتر وَلَدَ ٱللَّهُ وَإِنَّهُمْ لَكَـٰذِبُونَ ﴾ الصافات: ١٥١ – ١٥٢

واتە: ( ئەوە نیە ئەوان لە درۆی خۆیان دەڵێن * خودا کوڕی بووە ، وە بەڕاستی ئەوان درۆدەکەن ) وە ئەگەر تێکچوونی واتا هەبێت ئەوە حوکمی بەردەوامبوونە.

وەك: ﴿ فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴾

وە خاوەن ڕێڕەوی ( مذهب ) دووەم و سێهەم پشتیان بەوە بەستووە کە لە فەرموودەکەی( أم سلمة ) دا بەڵگەیەك نیە کە پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ بۆ هەموو قورئان

و بە بەردەوامی وای خوێندبێتەوە ، بەڵکو فەرموودە هەیە کە ئەوەی تایبەت بووە بە سوڕەی ( الفاتحة ) ، وە ئەوەش دەخاتە ڕوو کە ئەو فەرموودەیە بۆ دروستی ڕاوەستانە لەسەر ئایەتەکان نەك بۆ پێویستی.

## تێبینی/

- وا دیارە کە ئەو فەرموودەیە بۆ فاتیحەی ناو نوێژە ( والله أعلم ).
- ئەوەی پێی دەوترێت:(الوقف القبیح)بۆ کۆتایی هێنانە بە خوێندنەوە، نەك هەناسەدان (والله أعلم).

## وەستانی ناڕێک – ناشرین – ناشایستە ( الوقف القبيح ):

وەستان لەسەر ووتەیەکە کە تەواو نی یە لە خودی خۆی و بەستراوە بە ڕستەی دوای خۆی بە شێوەیەکی زۆر بەهێز لە رووی ماناو دەربڕینەوە ، ئەگەر هاتوو لە سەری وەستای مانایەکی جیاواز لە مانا بنەڕەتەکە دەبەخشێت کە ڕەنگە ناڕێک بێت و هەر لەبەر ئەوەش پێ دەوترێت وەستانی ناڕێک ، چونکە مانایەکەی لە کاتی وەستان لە سەری ناشرین دەبێت ، وەك وەستان لەسەر ئەم شوێنانە:

- وەستان لە سەر ووشەی :﴿ لَا يَعْلَمُهَآ ﴾لەئایەتی:

﴿ وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَ ﴾ الأنعام : ٥٩

- وەستان لە سەر ووشەی :﴿ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ لەئایەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُوا۟ مَا تَقُولُونَ ﴾ النساء: ٤٣.

- وەستان لە سەر ووشەی :﴿ لَا يَغْفِرُ ﴾ لە ئایەتی:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ ﴾ النساء : ٤٨

- وەستان لە سەر ووشەی :﴿ فَأَكَلَهُ ﴾ لە ئایەتی :

﴿ وَتَرَكْنَا يُوسُفَ عِندَ مَتَٰعِنَا فَأَكَلَهُ ٱلذِّئْبُ ﴾ يوسف : ١٧.

- وەستان لە سەر ووشەی :﴿ وَٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ لە ئایەتی :

﴿ يُدْخِلُ مَن يَشَآءُ فِى رَحْمَتِهِۦ وَٱلظَّٰلِمِينَ أَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًۢا ﴾ الإنسان :٣١

وە ئیمام (**الأشموني** ) ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێ : لە سورەتی ( **الفاتحة** ) سێزدە شوێن ناڕێك و ناشرینە قورئان خوێن تیایدا بوەستێ و دەستپێك بە ووشەکەی دوای ئەو بکات :﴿ ٱلْحَمْدُ / رَبِّ / مَٰلِكِ / يَوْمِ / إِيَّاكَ / ٱهْدِنَا / ٱلصِّرَٰطَ / صِرَٰطَ / ٱلَّذِينَ / غَيْرِ / ٱلْمَغْضُوبِ ، ﴿ عَلَيْهِمْ ﴾ ی دووەم.

## وەستانی زۆر ناڕێك ( الوقف أقبحُ القَبِيح ) :

وەستان لە سەر ووشەیەکی قورئانی ماناکەی بگۆڕێ کە ماناکە شیاو نیە بۆ خوای پەروەردگار ، تێگەیشتنەکە پێچەوانەی بیرباوەڕە(**العقيدة** ) ، وەك ( **إبن جزري** ) دەفەرموێت :

( وَغَيْرُ مَا تَـمَّ قَبِيْحٌ وَلَـهُ      أَلْوَقْفُ مُضْطَرًّا وَيُبْدَا قَبْلَه )

وەك : ئەم نموونانەی خوارەوە:

- وەستان لە سەر ووشەی :﴿ لَا يَسْتَحْيِۦٓ ﴾ لە ئایەتی :

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْيِۦٓ أَن يَضْرِبَ مَثَلًا مَّا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا ﴾البقرة:٢٦

- وەستان لە سەر ووشەی : ﴿ وَٱللَّهُ ﴾ لە ئایەتی:

﴿ فَبُهِتَ ٱلَّذِى كَفَرَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾البقرة: ٢٥٨

- وەستان لە سەر ووشەی : ﴿ وَلِلَّهِ ﴾ لە ئایەتی :

﴿ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ مَثَلُ ٱلسَّوْءِ ۖ وَلِلَّهِ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴾النحل : ٦٠

- وەستان لە سەر ووشەی : ﴿لَا يَهۡدِي﴾ لە ئایەتی:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ كَٰذِبٞ كَفَّارٞ﴾ الزمر: ٣

- وەستان لە سەر ووشەی : ﴿إِلَٰهٍ﴾ لەئایەتی:

﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ مُنذِرٞۖ وَمَا مِنۡ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ﴾ ص: ٦٥

- وەستان لەسەر ووشەی : ﴿أَرۡسَلۡنَٰكَ﴾ لە ئایەتی:

﴿وَبِٱلۡحَقِّ أَنزَلۡنَٰهُ وَبِٱلۡحَقِّ نَزَلَۗ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا مُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا﴾ الإسراء: ١٠٥

- وەستان لە سەر ووشەی: ﴿وَٱلۡإِنسَ﴾ لە ئایەتی:

﴿وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ﴾ الذاريات: ٥٦.

پێشەوا ( الداني ) دەفەرموێ : هەر خوێنەرێك هەوای نەفەسی بپچرێت لە سەر ئەم جۆرە ووشانە پێویستە (واجب)ـە بگەرێتەوە بۆ ڕستەی پێش خۆی، ووتەی پەروەردگار بگەینی هەندێك بە هەندێکی بە دروستی، خوێنەر ئەگەر وای نەکرد گوناهبار دەبێت ، جا ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە ، وەهەر کەسێك بە مەبەستی ئەنقەست وابکات ئەوە لە ئاینی ( إسلام ) دەردەچێت ، خوا پەنامان بدات.

# جیاوازی نێوان پچڕان و وەستان وبێدەنگ بوون

**١- پچڕان ( القطع ) :** بریتی یە لە پچڕانی دەنگ لە سەر ووشەیەکی قورئانی پیرۆز بە کۆتایی هێنانی خوێندنەوە ، جا لە نوێژ خوێندن بێت یان لە دەرەوەی نوێژ بێت.

پێویستە فێرخواز لەم شوێنانە خوێندنەوەی قورئان نەپچڕێنێت کە بە شێوەیەکی زۆر بەهێز لە رووی ماناو دەربڕینەوە بەستراوە بە ڕستەکەی دوای خۆی ، واتا پەیوەندی بەدوای خۆی هەیە.

وەك :

- ﴿ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْآيَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴾ چونکە پەیوەندی بەدوای خۆی هەیە: ﴿ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْآخِرَةِ ﴾

- ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴾ پچڕان لەم شوێنە دەرگای تەوبە دادەخات بەرووی تاوانباران :

﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ آل عمران: ٨٩

- ﴿ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ﴾ چونکە پەیوەندی بەدوای خۆی هەیە: ﴿ ثُمَّ ٱجْتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَىٰ ﴾ طه: ١٢٢

- ﴿ أَلَآ إِنَّهُم مِّنْ إِفْكِهِمْ لَيَقُولُونَ ﴾ چونکە پەیوەندی بەدوای خۆی هەیە: ﴿ وَلَدَ ٱللَّهُ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴾ الصافات: ١٥١ ١٥٢

٢- **وەستان ( الوقف )** : پچڕانی دەنگە لە سەر کۆتایی ووشەیەکی قورئانی پیرۆز لەگەڵ هەناسەدان و پشوودان بە نیاز و مەبەستی دەست پێ کردنەوەی قورئان خوێندن ، بەڵام بە مەرجێك ئەم شوێنەی کە خوێنەردەست پێدەکات گونجا و ڕێك بێت لە رووی واتاوە.

وەك : ﴿ وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ سُوٓءٗا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥۚ ﴾ دوای پشودان لە هەناسە دەستپێك بە: ﴿ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَالٍ ﴾ الرعد: ١١

٣- **بێدەنگ بوون ( السکت )** : بریتی یە لە پچڕانی دەنگ لە سەر ووشەیەکی قورئانی پیرۆز بە بێ هەناسەدان بۆ ماوەیەکی کەم بە مەبەستی بەردەوام بوون لە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز ، ئەم جۆرە بێدەنگ بوونە لە چوار ( ٤ ) جێگا و شوێن هاتووە کە پێویستە ( واجبة ) لە خوێندنەوەی پێشەوا (عاصم ) وە لە گێرانەوەی ( حفص )وە وە لە ڕێگای ( الشاطبية )ی یە وە.

١- بێدەنگ بوون لەسە رپیتی ( أَلِف ) لە ووشەی : ﴿ عِوَجَاۜ ﴾ الكهف: ١ لە کاتی گەیاندنی بە: ﴿ قَيِّمٗا ﴾ الكهف: ٢

٢- بێدەنگ بوون لە سەر پیتی ( أَلِف ) لە ووشەی :﴿ مَّرۡقَدِنَاۜۗ ﴾ ، لە کاتی گەیاندنی بە : ﴿ هَٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ ﴾ يس: ٥٢

٣- بێدەنگ بوون لە سەر پیتی ( نون ) لە ووشەی : ﴿ وَقِيلَ مَنۡۜ ﴾ ، لەکاتی گەیاندنی بە: ﴿ رَاقٖ ﴾ القيامة: ٢٧

٤- بێدەنگ بوون لە سەرپیتی ( لام ) لە ووشەی : ﴿ كَلَّاۖ بَلۡۜ ﴾ ، لە کاتی گەیاندنی بە : ﴿ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم ﴾ المطففين: ١٤

• وەستان لە سەر: ﴿عِوَجَا ۜ﴾ لەگەڵ هەناسە وەرگرتن ، وەستان لەسەری روونكردنەوەیە كە ﴿قَيِّمًا﴾ پەیوەست نیە بە پێشە خۆی لە رووی ( إعراب )ـەوە ، بەڵكو ( منصوب )ـە بە ( فعل مُضمَر تقديره ) ﴿أنْزَلَهُ قَيِّمًا﴾

• وەستان لەسەر :﴿مَّرْقَدِنَا ۜ﴾ تەواو ( التام )ـە كۆتایی قسەی بێ باوەڕانە ، دەستپێك بە : ﴿هَٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحْمَٰنُ﴾ قسەی ئەوان نیە بەڵكو ووتەی فریشتەیە یان باوەڕدارانە.

• بێدەنگ بوون لە سەر : ﴿وَقِيلَ مَنْ ۜ رَاقٍ﴾ لەگەڵ : ﴿كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ﴾ روونكردنەوەیەكە دوو ووشەیە ، تێك هەڵكێشان نابێت چونكە ماناكە تێك دەدات.

**جگە لە و چوار شوێنەی رابردوو دووشوێنی تریش هەن لە قورئانی پیرۆز رێگەپێدراوە قورئان خوێن ( السكت ) بكات:**

١- **السكت :** لە كۆتایی سورەتی ( الأنفال ) خوێنەر دەنگ بپچڕێنی بە بێ هەناسەدان بە مەبەستی بەردەوام بوون لە خوێندنەوەی قورئان ، بەم شێوازە دەردەبردرێ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ (السكت) لەسەر ووشەی ﴿عَلِيمٌ﴾ دەبێت پاشان خوێندنی ﴿بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾

**٢- السكت:** لە ئایەتی: ﴿ مَآ أَغۡنَىٰ عَنِّي مَالِيَهۡۜ ۝٢٨ هَلَكَ عَنِّي سُلۡطَٰنِيَهۡ ﴾الحاقة:٢٨- ٢٩،

لە کاتی گەیاندنی ﴿ مَالِيَهۡۜ ← هَلَكَ ﴾

بە ئاشکراکردنی پیتی ( هاء ) لە کاتی گەیاندنی ووشەی ( مَالِيَهۡ ) بە (هَلَكَ) بەم جۆرە دەخوێندرێتەوە : ﴿مَالِيَهۡۜ وەستان بەبێ دەنگ هَلَكَ﴾ خوێنەر بێ دەنگ دەبێت لە سەر پیتی (هاء )ی(مَالِيَهۡ)

## تێبینی /

- وریا بوون لە ڕۆیشتنی هەوای هەناسە لەکاتی بێ دەنگ بوون (السكت ).
- وریا بوون لە درووستبونی پیتی ( همزة ) لەکاتی بێ دەنگ بوون (السكت ).
- هێما و نیشانەی ( السكت ) لە قورئانی پیرۆز لە شێوەی پیتی (س)ێکی بچووک دانراوە.
- حوکمی شاردنەوە لە سەر: ﴿عِوَجَاۜ﴾ جێ بەجێ نابێت نیشانەی بەبێ تەنوین نوسراوە.
- حوکمی تێک هەڵکێشان لە سەر پیتی ( راء ) لە : ﴿مَنۡۜ رَاقٖ﴾ و ﴿بَلۡۜ رَانَ﴾ جێ بەجێ نابێت نیشانەی بەبێ شەددە نوسراوە.

# حوكمی وەستان لەسەر

## ( نَعَمْ ، بَلَىٰ ، كَلَّا )

**یەكەم /(نَعَمْ):**

بریتی یە لە پیتی وەڵام ، كە وەڵامی ووتەی پێش خۆی دەداتەوە ، جیاوازی واتای بە جیاوازی واتای پێش خۆی هەیە ، لە چوار ( ٤ ) شوێن لە قورئانی پیرۆز هاتووە ، وەستان لەسەری دەبێت بە دوو بەش ، تەنها لە نموونەی یەكەم دروستە قورئان خوێن بوەستێ ، چونكە وەستان تێر( كافي )ە ، لە سێ ( ٣ ) شوێنەكەی تر رێ پێنەدراوە قورئان خوێن لە سەری بوەستێ:

- ﴿ فَهَلْ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا قَالُوا نَعَمْ ﴾ الأعراف: ٤٤
- ﴿ قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ لَمِنَ الْمُقَرَّبِينَ ﴾ الأعراف: ١١٤
- ﴿ قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ إِذًا لَّمِنَ الْمُقَرَّبِينَ ﴾ الشعراء: ٤٢
- ﴿ قُلْ نَعَمْ وَأَنتُمْ دَاخِرُونَ ﴾ الصافات: ١٨

ئیمامی ( بدرالزركشي ) ( رەحمەتی خوای لێ بێت ) دەفەرموێت : هەڵبژێردراوە ( واچاكترە ) كە قورئان خوێن لەسەر (نَعَمْ) نەوەستێ لە سێ ( ٣ ) شوێنەكەی تر ، چونكە لە رووی واتاوە پەیوەستە و پەیوەندی بە پێش و دوای خۆی هەیە.

دووەم/ (بَلَىٰ) بریتی یە لە پیتی وەلاّم، وەلاّمی ووتەی پێش خۆی دەداتەوە، بە واتای نەخێر (نەرێ) دێت، لە بیست و دوو ( ٢٢ ) شوێن لە قورئانی پیرۆز هاتووە، وەستان لەسەری دابەش دەبێت بۆسێ (٣) بەش:

بەشی یەکەم :

هەڵبژێردراوە لە لایەن زۆربەی قاریئەکان و زانایانی زمانەوانی ، کە دروستە قورئان خوێن لە سەر ( بَلَىٰ ) بوەستێ ، چونکە وەلاّمی پێش خۆی دەداتەوە و پەیوەست نیە لە رووی ماناوە بە دوای خۆی ، ئەمەش لە دە ( ١٠ ) شوێن لە قورئانی پیرۆز هاتووە:-

١- ﴿أَمْ تَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨٠﴾ بَلَىٰ﴾ البقرة: ٨٠ — ٨١

٢- ﴿قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿١١١﴾ بَلَىٰ﴾ البقرة:١١١—١١٢

٣- ﴿وَيَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾ بَلَىٰ﴾ آل عمران: ٧٥ — ٧٦

٤- ﴿بِثَلَاثَةِ آلَافٍ مِّنَ الْمَلَائِكَةِ مُنزَلِينَ ﴿١٢٤﴾ بَلَىٰ﴾ آل عمران: ١٢٤ — ١٢٥

٥- ﴿وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَىٰ﴾ الأعراف: ١٧٢

٦- ﴿فَأَلْقَوُا السَّلَمَ مَا كُنَّا نَعْمَلُ مِن سُوءٍ بَلَىٰ﴾ النحل: ٢٨

٧- ﴿عَلَىٰ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم بَلَىٰ﴾ يس: ٨١

٨- ﴿قَالُوا أَوَلَمْ تَكُ تَأْتِيكُمْ رُسُلُكُم بِالْبَيِّنَاتِ قَالُوا بَلَىٰ﴾ غافر: ٥٠

٩- ﴿عَلَىٰ أَن يُحْيِيَ الْمَوْتَىٰ بَلَىٰ﴾ الأحقاف: ٣٣

١٠- ﴿إِنَّهُ ظَنَّ أَن لَّن يَحُورَ ﴿١٤﴾ بَلَىٰ﴾ الانشقاق: ١٤ — ١٥

## بەشی دووەم/

ڕێگانەدراوە قورئان خوێن لەسەری ( بَلَىٰ ) بوەستێ ، چونکە پەیوەندی بە پێش و دوای خۆی هەیە ، ئەمەش لە حەوت ( ٧ ) شوێن هاتووە لە قورئانی پیرۆز:

١- ﴿ قَالُواْ بَلَىٰ وَرَبِّنَا ﴾ الأنعام: ٣٠

٢- ﴿ بَلَىٰ وَعۡدًا عَلَيۡهِ حَقًّا ﴾ النحل: ٣٨

٣- ﴿ قُلۡ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتَأۡتِيَنَّكُمۡ ﴾ سبأ: ٣

٤- ﴿ بَلَىٰ قَدۡ جَآءَتۡكَ ءَايَٰتِي ﴾ الزمر: ٥٩

٥- ﴿ قَالُواْ بَلَىٰ وَرَبِّنَا ﴾ الأحقاف: ٣٤

٦- ﴿ قُلۡ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبۡعَثُنَّ ﴾ التغابن: ٧

٧- ﴿ بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّيَ بَنَانَهُۥ ﴾ القيامة: ٤

ئیمامی ( بدرالزركشي ) ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) دەفەرموێ : لەم شوێنانە ڕا جیایی لەسەر نیە لە ڕێگری کردنی وەستان لەسەر ( بَلَىٰ ) واتە : دروست نیە لەم شوێنانە قورئان خوێن بوەستێت ، وە گونجاو و جوانیش نیە دەستپێك بە ( بَلَىٰ ) بکرێت لەم حەوت ( ٧ ) شوێنە ، چونکە بۆ دوای خۆی وەڵامە.

## بەشی سێیەم/

رای جیایی لەسەرە لە دروستی وەستان لەسەر ( بَلَىٰ ) ، بەڵام ووتەی پەسند رێگرە لە وەستان لەسەر ( بَلَىٰ ) ، چونکە پەیوەندی واتایی هەیە بە پێش و دوای خۆی ، ئەمەش لە پێنج ( ٥ ) شوێن لە قورئانی پیرۆز هاتووە.

١- ﴿ قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطۡمَئِنَّ قَلۡبِي ﴾ البقرة: ٢٦٠

٢- ﴿ قَالُواْ بَلَىٰ وَلَٰكِنۡ حَقَّتۡ ﴾ الزمر: ٧١

٣- ﴿ بَلَىٰ وَرُسُلُنَا لَدَيۡهِمۡ يَكۡتُبُونَ ﴾ الزخرف: ٨٠

٤- ﴿ قَالُواْ بَلَىٰ وَلَٰكِنَّكُمۡ فَتَنتُمۡ أَنفُسَكُمۡ ﴾ الحديد: ١٤

٥- ﴿ قَالُواْ بَلَىٰ قَدۡ جَآءَنَا نَذِيرٞ ﴾ الملك: ٩

## سێیەم / ( كَلَّا )

پیتی ( كَلَّا ) لە لایەن زانایان بە چەند مانایەك لێك دراوەتەوە ، وەك ئەم خالانەی خوارەوە:

- بەرپەرچدانەوە ( **الردع** ).
- سەرزەنشت كردن ، قەدەغە كردن ، رێگری كردن ( **الزجر** ).
- وەلام دانەوە ( **حقاً** ) ( **الجواب بمثابة أي / نعم** ).
- ئامرازی كردنەوە ( **الاستفتاح** ) ( **بمنزلة الاستفتاحية** ).

**لە قورئانی پیرۆز وەستان لەسەر ( كَلَّا ) دەبێت بە چوار ( ٤ ) جۆر حوكم:**

### یەكەم /

لە یازدە ( ١١ ) شوێن رێك و هەلبژێردراوە بۆ قورئان خوێن بوەستێ لە سەر ( كَلَّا ) وە دەستپێك بە ووشەی دوای ئەو بكات.

١- ﴿ أَطَّلَعَ ٱلْغَيْبَ أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَٰنِ عَهْدًا ﴿٧٨﴾ كَلَّاۚ ﴾ [١] مريم: ٧٨ – ٧٩

٢- ﴿ وَٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةً لِّيَكُونُواْ لَهُمْ عِزًّا ﴿٨١﴾ كَلَّاۚ ﴾ مريم: ٨١ – ٨٢.

٣- ﴿ لَعَلِّيٓ أَعْمَلُ صَٰلِحًا فِيمَا تَرَكْتُۚ كَلَّآۚ ﴾ المؤمنون: ١٠٠.

٤- ﴿ قُلْ أَرُونِيَ ٱلَّذِينَ أَلْحَقْتُم بِهِۦ شُرَكَآءَۖ كَلَّاۚ ﴾ سبأ: ٢٧.

---

[١]) یەكەم شوێنە لە قورئانی پیرۆز لە رووی ریزبەندی كە بە ( كَلَّا ) دەست پێدەكات.

٥- ﴿ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ يُنجِيهِ ﴿١٤﴾ كَلَّآ ﴾ المعارج: ١٤ — ١٥.

٦- ﴿ أَيَطْمَعُ كُلُّ ٱمْرِيٍٕ مِّنْهُمْ أَن يُدْخَلَ جَنَّةَ نَعِيمٍ ﴿٣٨﴾ كَلَّآ ﴾ المعارج: ٣٨ — ٣٩.

٧- ﴿ ثُمَّ يَطْمَعُ أَنْ أَزِيدَ ﴿١٥﴾ كَلَّآ ﴾ المدثر: ١٥ — ١٦.

٨- ﴿ بَلْ يُرِيدُ كُلُّ ٱمْرِيٍٕ مِّنْهُمْ أَن يُؤْتَىٰ صُحُفًا مُّنَشَّرَةً ﴿٥٢﴾ كَلَّا ﴾ المدثر: ٥٢ — ٥٣.

٩- ﴿ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ كَلَّا ﴾ المطففين: ١٣ — ١٤ .

١٠- ﴿ وَأَمَّآ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَهَٰنَنِ ﴿١٦﴾ كَلَّا ﴾ الفجر: ١٦ — ١٧.

١١- ﴿ يَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُۥٓ أَخْلَدَهُۥ ﴿٣﴾ كَلَّا ﴾ الهمزة: ٣ — ٤.

## دووەم /

له هەژده ( ١٨ ) شوێن جوان و گونجاو نیه قورئان خوێن لەسەر (كَلَّا) بوەستێ ، بەڵام دەستپێك بە ( كَلَّا ) دەبێت.

١- ﴿ كَلَّا وَٱلْقَمَرِ ﴿٣٢﴾ ﴾ المدثر: ٣٢.

٢- ﴿ كَلَّآ إِنَّهُۥ تَذْكِرَةٌ ﴿٥٤﴾ ﴾ المدثر: ٥٤.

٣- ﴿ كَلَّا لَا وَزَرَ ﴿١١﴾ ﴾ القيامة: ١١.

٤- ﴿ كَلَّا بَلْ تُحِبُّونَ ٱلْعَاجِلَةَ ﴿٢٠﴾ ﴾ القيامة: ٢٠ .

٥- ﴿ كَلَّآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلتَّرَاقِىَ ﴿٢٦﴾ ﴾ القيامة: ٢٦.

٦- ﴿ كَلَّا سَيَعْلَمُونَ ﴿٤﴾ ﴾ النبأ: ٤.

٧- ﴿ كَلَّآ إِنَّهَا تَذۡكِرَةٞ ﴿١١﴾ ﴾ عبس: ١١

٨- ﴿ كَلَّا لَمَّا يَقۡضِ مَآ أَمَرَهُۥ ﴿٢٣﴾ ﴾ عبس: ٢٣.

٩- ﴿ كَلَّا بَلۡ تُكَذِّبُونَ بِٱلدِّينِ ﴿٩﴾ ﴾ الانفطار: ٩ .

١٠- ﴿ كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلۡفُجَّارِ لَفِي سِجِّينٖ ﴿٧﴾ ﴾ المطففين: ٧.

١١- ﴿ كَلَّآ إِنَّهُمۡ عَن رَّبِّهِمۡ يَوۡمَئِذٖ لَّمَحۡجُوبُونَ ﴿١٥﴾ ﴾ المطففين: ١٥.

١٢- ﴿ كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلۡأَبۡرَارِ لَفِي عِلِّيِّينَ ﴿١٨﴾ ﴾ المطففين: ١٨.

١٣- ﴿ كَلَّآ إِذَا دُكَّتِ ٱلۡأَرۡضُ دَكّٗا دَكّٗا ﴿٢١﴾ ﴾ الفجر: ٢١.

١٤- ﴿ كَلَّآ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَيَطۡغَىٰٓ ﴿٦﴾ ﴾ العلق: ٦.

١٥- ﴿ كَلَّا لَئِن لَّمۡ يَنتَهِ لَنَسۡفَعَۢا بِٱلنَّاصِيَةِ ﴿١٥﴾ ﴾ العلق: ١٥

١٦- ﴿ كَلَّا لَا تُطِعۡهُ وَٱسۡجُدۡۤ وَٱقۡتَرِب۩ ﴿١٩﴾ ﴾ العلق: ١٩.

١٧- ﴿ كَلَّا سَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ﴿٣﴾ ﴾ التكاثر: ٣.

١٨- ﴿ كَلَّا لَوۡ تَعۡلَمُونَ عِلۡمَ ٱلۡيَقِينِ ﴿٥﴾ ﴾ التكاثر: ٥.

شێخ ( **محمود خليل الحصري** ) ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) دەفەرموێت : لەم هەژدە ( ١٨ ) شوێنە هەڵبژێردراوە لە لایەن ئێمەو قاریئەکان و زانایانی زمان ( **اللغة** ) کە دروستە دەستپێک بە ( كَلَّا ) بێت .

## سێیەم /

لە دوو ( ٢ ) شوێن گونجاو و جوان نیە قورئان خوێن لەسەر ( كَلَّا ) بوەستێ ، جوان و گونجاویش نیە دەستپێك بە ( كَلَّا ) بكات ، بەڵكو پیتی ( كَلَّا ) دەگەیەنێ بە ووشەی دوای خۆی ، چونكە پەیوەندی بە پێش و دوای خۆی هەیە.

١- ﴿ ثُمَّ كَلَّا سَيَعْلَمُونَ ﴿٥﴾ ﴾النبأ: ٥.

٢- ﴿ ثُمَّ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٤﴾ ﴾التكاثر: ٤.

## چوارەم /

لە دوو ( ٢ ) شوێن گونجاو و جوان نیە قورئان خوێن لەسەر (كَلَّا ) بوەستێ ، وە رێپێنەدراوە كە دەستپێك بە ( كَلَّا ) بكرێت ، بەڵكو پەیوەندی تەنها بە ووشەی پێش خۆی هەیە.

١- ﴿ قَالَ كَلَّا فَاذْهَبَا بِـَٔايَٰتِنَآ إِنَّا مَعَكُم مُّسْتَمِعُونَ ﴿١٥﴾ ﴾الشعراء: ١٥.

٢- ﴿ قَالَ كَلَّآ إِنَّ مَعِىَ رَبِّى سَيَهْدِينِ ﴿٦٢﴾ ﴾الشعراء: ٦٢.

## وەستانی (السنة )

پێی دەوترێت وەستانی ( جبريل عليه السلام ) ، یان وەستانی شوێن کەوتن ( الإتباع ) واتە لەم شوێنانەی (جبريل عليه السلام) وەستاوە پێغەمبەریش ( صلى الله عليه وسلم ) لە دوا ئەو وەستاوە ، هاوەڵانیش بەم شێوەیە وەریانگرتووە و خوێندوویانەتەوە ، ئەمەش لە دە ( ١٠ )[١] شوێن هاتووە لە قورئانی پیرۆز.

١- شوێنی یەکەم و دووەم : ﴿ فَٱسۡتَبِقُواْ ٱلۡخَيۡرَٰتِۚ ﴾البقرة: ١٤٨- المائدة: ٤٨

٢-شوێنـــــی سێیــــــەم : ﴿ قُلۡ صَدَقَ ٱللَّهُۗ ﴾ آل عمران: ٩٥

٣-شوێنـــــی چـــوارەم : ﴿ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنۡ أَقُولَ مَا لَيۡسَ لِي بِحَقٍّۚ ﴾المائدة: ١١٦

٤-شوێنـــــی پێنجـــــەم : ﴿ قُلۡ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ ﴾ يوسف: ١٠٨

٥-شوێنـــــی شەشـــــەم: ﴿كَذَٰلِكَ يَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡأَمۡثَالَ ﴾ الرعد: ١٧

٦-شوێنـــــی حەوتـــــەم: ﴿ وَٱلۡأَنۡعَٰمَ خَلَقَهَاۗ ﴾النحل: ٥

٧-شوێنـــــی هەشتـــــەم : ﴿ أَفَمَن كَانَ مُؤۡمِنٗا كَمَن كَانَ فَاسِقٗاۚ لَّا يَسۡتَوُۥنَ ﴾السجدة : ١٨

٨-شوێنـــــی نۆیـــــەم : ﴿ فَحَشَرَ ﴾ النازعات : ٢٣

٩-شوێنـــــی دەیـــــەم : ﴿لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ خَيۡرٞ مِّنۡ أَلۡفِ شَهۡرٖ ﴾ القدر : ٣

---

[١] ئەم دە(١٠ ) شوێنەیە شێخ (أ حمد بن عبدالكريم الأشموني ) باسی کردووە لەپەرتووکی( منار الهدى في بيان الوقف والابتداء ) ئەویش لەشێخ السّخاوی

وە هەندێك لە پەرتووكەكانی زانستی ( تەجوید ) حەوت ( ٧ ) شوێنی تریان زیاد كردووە كە ئەمانەن: -

١- شوێنـــی یـــــەكەم : ﴿ أَنْ أَنذِرِ ٱلنَّاسَ ﴾ یونس : ٢

٢- شوێنـــــی دووەم : ﴿ وَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ ﴾ یونس : ٦٥

٣- شوێنی ســـێیەم : ﴿ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٌ ﴾ النحل : ١٠٣

٤- شوێنی چــــوارەم : ﴿ يَٰبُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ ﴾ لقمان : ١٣

٥- شوێنی پێنجـــــەم : ﴿ أَنَّهُمْ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ﴾ غافر : ٦

٦- شوێنـــی شەشـــەم : ﴿ مِّن كُلِّ أَمْرٍ ﴾ القدر : ٤

٧- شوێنـــی حەوتـــەم : ﴿ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَٱسْتَغْفِرْهُ ﴾ النصر : ٣

شێخ (محمود خلیل حصري) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێ: وەستانە كە لە حەڤدە (١٧) شوێن دەبێت. وەستان لەم شوێنانە پێی دەڵێن وەستانی (السنة)، وە وەستانی (جبریل) (علیه السلام)، وە وەستانی شوێن كەوتن ( الإتباع ) لەبەرئەوەی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) لەم شوێنانە ئەوەستا بە بەردەوامی وایان ووتووە بەڵام لەگەڵ بەدواداچوون بە چڕی و گەڕان لە هەموو لایەكەوە وە بە جیاوازی سەرچاوەكان لە دایكی كتێبەكان لە زانستی قورئان و ڕاڤە و سوننەوە وە لە هەموو ئەسەرەكانیش ، هیچ شوێن پێیێكی ڕاست یان لاواز نابینرێ ئاماژە بەم جۆرە وەستانە بكات لە هەموو ئەو شوێنانە یان لە هەندێك سوونەتە كرداریيەكان و ووتەییەكان.لەوانەیە پاش ئەمە تۆزێك لەدڵەڕاوكێیەكە كەم بكات و ویژدان ئاسوودە بكات.

# جۆرەکانی دەست پێ کردن لە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز

## هەڵبژاردەیی ﴿اختياريّ﴾

دەست پێ کی راستەقینە (ابتداءٌ حقيقيّ) : بریتی یە لەدەست پێ کردنێکی سەربەخۆ لە سەرەتای خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز لە رووی واتاوە پەیوەندی نەبێت بە پێشەخۆی جا لە ناونوێژ بێت یان لەدەرەوەی نوێژ.

- رێپێدراوی تەواو جائز ( تامٌ ) ← تەواو ( تامٌ )
- رێپێنەدراو ( غيرُ جائز ) ← بەس ( كافٍ )
- رێپێدراو (جائز) ← رێك (حَسَنٌ)

## بۆ تاقیکردنەوە ﴿اختباريّ﴾

دەست پێ کی زیادە (ابتداءٌ إضافيّ) : بریتی یە لە دەست پێ کردنەوەی خوێندن لە هەمان کات پاش وەستان، ئەوەش تەنها بە ئارەزووی خوێنەردەبێت بە مەرجێك دەست پێ کردنەکە مانای جوان ببەخشێت ورێگە پێ دراوبێت.

- رێپێنەدراو ( غيرُ جائز ) ← نارێك ( قبيحٌ )

## پێناسەی دەست پێ کردن ( الابتداء )

دەست پێ کردن لە رووی زمانەوانی: دەست پێ کردن بە شتێك بۆ یەکەم جار، واتە دەست پێ کردن و دەست بە کار بوون.

دەست پێ کردن لە رووی زاراوە : چوونە ناو قورئان خوێندنەوە پاش پچڕان یان وەستان ، ئەوەش تەنها بە ئارەزووی خوێنەر دەبێت بە مەرجێك دەست پێ کردنەکە مانای جوان ببەخشێت و پەیوەندی بە پێشە خۆی نەبێت .

## جۆرەکانی دەست پێ کردنی ڕێگە پێدراو

دەست پێ کردنی ڕێگە پێ دراو : واتە دەست کردن بە قسەیەکی سەربەخۆ کە ویستی خوای گەورە ( الله ) تیایدا روون دەبێتەوە .

**یەکەم / دەست پێ کردنی تەواو ( الابتداء التام ) :**

واتە پەیوەست نەبێت بەو ڕستەی پێش خۆی نە لە رووی خوێندنەوە نە لە رووی مانا.

وەکو: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴾

**روون کردنەوە /**

- دەست پێ کردن بە : ﴿ أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾ تەواوە.
- دەست پێ کردن بە : ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ الفاتحة: ١ ، تەواوە.
- دەست پێ کردن لەسەرەتای هەموو سورەتێك تەواوە .
- دەست پێ کردن لە سەرەتای هەموو چیرۆکە قورئانیەکان تەواوە.

## دووەم / دەست پێ کردنی تێر ، بەس ( الابتداء الكافي ) :

واتە پەیوەستە بە ڕستەی پێش خۆی تەنها لە رووی ماناوە ئەم جۆرە دەست پێ کردنە بە دوای وەستانی تێر – بەس – ( الوقف الكافي ) دا دێت.

وەکـــو : ﴿ خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَعَلَىٰ سَمۡعِهِمۡۖ وَعَلَىٰٓ أَبۡصَٰرِهِمۡ غِشَٰوَةٞۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴾ بقرة : ٧

❖ دەست پێ کردن بە: ﴿ وَكَفَىٰ ﴾ لە ئایەتی: ﴿ فَإِذَا دَفَعۡتُمۡ إِلَيۡهِمۡ أَمۡوَٰلَهُمۡ فَأَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِمۡۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبٗا ﴾ النساء:٦

❖ دەست پێ کردن بە: ﴿ وَكَفَىٰ ﴾ لە ئایەتی: ﴿ ٱنظُرۡ كَيۡفَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَۖ وَكَفَىٰ بِهِۦٓ إِثۡمٗا مُّبِينًا ﴾ النساء:٥٠

❖ دەست پێ کردن بە: ﴿ وَكَانَ ﴾ لە ئایەتی: ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَعۡفُوَ عَنۡهُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَفُوًّا غَفُورٗا ﴾ النساء:٩٩

❖ دەست پێ کردن بە : ﴿ وَكَانَ ﴾ لە ئایەتی: ﴿ وَجَعَلۡنَا بَعۡضَكُمۡ لِبَعۡضٖ فِتۡنَةً أَتَصۡبِرُونَۗ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرٗا ﴾ الفرقان: ٢٠

❖ دەست پێ کردن بە : ﴿ وَٱللَّهُ ﴾ لە ئایەتی : ﴿ يَجۡعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمۡ فِيٓ ءَاذَانِهِم مِّنَ ٱلصَّوَٰعِقِ حَذَرَ ٱلۡمَوۡتِۚ وَٱللَّهُ مُحِيطُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾ البقرة: ١٩

## سێ یەم / دەست پێ کردنی ڕێك و چاك ( الابتداء الحسن ):

ئەو دەست پێ کردنەیە پاش وەستان لە سەری لە وەستانی تەواو و تێر و بە چاك دانانرێت نە لە چاك و نە لە خراپ ، تەنها لەو کاتە نەبێت کە سەرەتای ئایەت بێت ، ئەو کات بە باش دەزانرێت دەست پێ بکرێت ئەمە هەلبژاردەی زۆرینەی قاریئەکانە

وەك :

- وەستان لە سەر ئایەتی: ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ﴾ ودەست پێ کردن بە: ﴿فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ﴾ البقرة: ٢١٩ ,٢٢٠
- وەستان لە سەر ئایەتی: ﴿وَإِنَّكُمْ لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم مُّصْبِحِينَ﴾ ودەست پێ کردن بە: ﴿وَبِاللَّيْلِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ الصافات: ١٣٧، ١٣٨

## چوارەم / دەست پێ کردن بۆ تاقی کردنەوە : ( اختباريّ ) ئەو دەست پێ کردنە بۆ فێرکردن بەکاردێت ، وەك ئەم نموونەی خوارەوە:

| وشە | شێوەی خوێندنەوە لە دەست پێ کردن |
|---|---|
| ﴿أَوْتُمِنَ﴾ | لە دەستپێکدا بەم شێوەیە دەخوێندرێتەوە ﴿أُوتُمِنَ﴾ البقرة: ٢٨٣ |
| ﴿قُلِ اللَّهُمَّ﴾ | لە دەستپێکدا بەم شێوەیە دەخوێندرێتەوە ﴿أَللَّهُمَّ﴾ آل عمران: ٢٦ |
| ﴿إِنِ امْرُؤٌا﴾ | لە دەستپێکدا بەم شێوەیە دەخوێندرێتەوە ﴿إِمْرُؤٌا﴾ النساء: ١٧٦ |
| ﴿ثُمَّ اقْضُوا﴾ | لە دەستپێکدا بەم شێوەیە دەخوێندرێتەوە ﴿إِقْضُوا﴾ یونس: ٧١ |
| ﴿فَقَالُوا ابْنُوا﴾ | لە دەستپێکدا بەم شێوەیە دەخوێندرێتەوە ﴿إِبْنُوا﴾ الکهف: ٢١ |

﴿ ثُمَّ لْيَقْطَعْ ﴾له دەستپێكدا بەم شێوەیەدەخوێندرێتەوە﴿ لِـيَقْطَعْ ﴾الحج: ١٥

﴿ أَنِ ٱمْشُواْ ﴾له دەستپێكدا بەم شێوەیەدەخوێندرێتەوە﴿ إِ مْشُواْ ﴾ ص: ٦

﴿ وَأَصْحَٰبُ لْـَٔيْكَةِ ﴾له دەستپێكدابەم شێوەیەدەخوێندرێتەوە﴿ أَ لئَيْكَةِ ﴾ص: ١٣

﴿ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِۖ ٱئْتُونِي ﴾له دەستپێكدا بەم شێوەیەدەخوێندرێتەوە﴿ إِ يْتُونى ﴾
الأحقاف: ٤

## جۆرەكانی دەست پێ كردنی نارێك و ناشایستە

**یەكەم** / دەست پێ كردنی نارێك و ناشایستە ( الابتداء القبیح ) : ئەو دەست پێ كردنەیە كە ماناكە تێك ئەدات یان مانایەك دەبەخشێت كە ویستی خوای گەورە ( الله )ـی لە سەر نیە.

وەك ئەم نموونانە :

❖ دەست پێ كردن بە ووشەی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ ﴾

لـــە ئايـــەتی : ﴿ لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ ﴾
آل عمران: ١٨١

❖ دەست پێ كردن بە ووشەی : ﴿ يَدُ ٱللَّهِ ﴾

له ئایەتی : ﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغْلُولَةٌ ﴾ المائدة: ٦٤

❖ دەست پێ كردن بەووشەی : ﴿ عُزَيْرٌ ٱبْنُ ﴾ یان دەست پێ كردن بە:
﴿ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ ﴾

لەئایەتی: ﴿ وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ عُزَيۡرٌ ٱبۡنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَى ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ ٱللَّهِۖ ذَٰلِكَ قَوۡلُهُم بِأَفۡوَٰهِهِمۡۖ ﴾ التوبة: ٣٠

❖ دەست پیٚ کردن بەووشەی : ﴿ ٱللَّهُ ﴾

لەئایەتی : ﴿ وَإِذۡ يَقُولُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورٗا ﴾ الأحزاب: ١٢

❖ دەست پیٚ کردن بەووشەی : ﴿ لَآ أَعۡبُدُ ﴾

لەئایەتی : ﴿ وَمَا لِيَ لَآ أَعۡبُدُ ٱلَّذِي فَطَرَنِي وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴾ يس: ٢٢

**دووەم** / دەست پیٚ کردنی بە خورتی ، ناڕەوا ، ( **الابتداء التعسفي** ) : ئەو دەست پیٚ کردنە ناڕەوایە کە هەندیٚ زمانەوان خورتی تیادا دەکەن یان قورئان خویٚنەکان بە خۆ ماندو کردنیٚکەوە دەیکەن یان ئارەزو بازەکان ماناکەی لیٚك ئەدەنەوە بە دەست پیٚ کردنیٚك کە نابیٚ بە ئەنقەست دەست پیٚ بکریٚت بەڵکو دەبیٚ بە تەواوەتی بە دوای ماناکەی دا بگەڕیٚت و لە رووی دا بوەستیٚت.

وەك : وەستان لە سەر ﴿ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡ ﴾ و دەست پیٚ کردن بە ﴿ هُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴾ البقرة: ٦ وەستان لەسەر ﴿ لَا تُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ ﴾ و دەست پیٚ کردن بە ﴿ بِٱللَّهِۖ إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ ﴾ لقمان: ١٣ ، ئەوە بە ناڕەوایە .

# حوكمی وەستان لە كۆتایی ووشە

سكون | رەوم | نیشمام

١- سكونی تەواو: بریتی یە لە داڕنینی سێ جۆرە جووڵەكان ﴿ (ـٌ)،(ـً)،(ـٍ) ﴾ ، ﴿ ـُ ، ـَ ، ـِ ﴾ لە كاتی وەستان لە سەرپیتی كۆتایی ووشە بەمەبەستی پشوودان و وەرگرتنی هەوای هەناسە ( نَفَس ) ئەمەش بنەڕەتە لە كاتی وەستان، چونكە عەرەب بە جووڵە ناوەستێت لە كۆتایی ووشە.

٢- رەوم :بریتی یە لە هێنان و دەربڕینی بەشێكی جووڵە ( حركة ) بە دەنگێكی نزم ، بە مەرجێك جووڵە (حركة) كە ( مرفوع – مضموم – مجرور – مكسور ) بێت .

- نموونەی ( مرفوع ) : ﴿ نَسۡتَعِينُ ﴾ الفاتحة : ٥
- نموونەی ( مضموم ) : ﴿ يَـٰشُعَيۡبُ ﴾ هود : ٨٧
- نموونەی ( مجرور ) : ﴿ ٱلرَّحِيمِ ﴾ الفاتحة : ٣
- نموونەی ( مكسور ) : ﴿ هَـٰٓؤُلَآءِ ﴾ النساء : ١٤٣

## هەندێ روونکردنەوە دەربارەی ( رەوم ):

- بە شێوەیەك زۆربەی دەنگ تیایدا دەڕوات و كز دەبێت.
- كەسی چاوساغ و نابینا لە نزیكەوە هەستی پێ دەكات.
- لە سێ بەشی جوولە ( حركة ) دوو بەشی دەڕوات و بەشێكی دەمێنێ.
- لە ناوەڕاست و كۆتایی ووشە دێت ، لە ریوایەتی ( حفص ) نموونەی ناوەڕاست تەنها لە یەك شوێن هاتووە : ﴿تَأۡمَنَّا﴾ یوسف : ١١.
- رەوم حوكمی وەك حوكمی گەیاندن ( وصل ) وایە.
- ئەگەر پیتی پێش كۆتایی پیتەكانی( المد ) بوون ، ئەوە تەنها بە دوو جوولە ( حركة ) درێژ دەكرێتەوە.
- فێرخواز لە رووی كرداری ( عملي ) لە دەم و زاری مامۆستای شارەزا و لێزان فێر دەبێت ، واتە بە بێ بوونی مامۆستای شارەزا فێر نابێت.

٣- ئیشمام : بریتی یە لە خڕ كردنی دوو لێوەكان لە دوای بە ( ساكن ) كردنی پیتی ( مرفوع – مضموم ) بە دەربڕینێكی بێ دەنگ كە كەسی چاوساغ دەیبینێت وهەستی پێ دەكات ، بەڵام نابینا نایبینێت و هەستی پێ ناكات ،نموونە : ﴿نَسۡتَعِينُ﴾ الفاتحة : ٥ ، ئەگەر بمانەوێ بوەستین بە ئیشمام پیتی ( نون ) دەكەین بە ( سكون ) ئینجا دوولێوەكانمان خردە كەین .

## جۆرەکانی ئیشمام :-

- خڕ کردنی دوو لێوەکان له دوای به ( ساکن ) کردنی پیتی (مرفوع – مضموم ) به دەربڕینێکی بێ دەنگ.
- شاردنەوەی جووڵه لەکاتی به ( ساکن ) کردنی لەنێوان جووڵەوە.

نموونه :﴿تَأۡمَنَّا﴾ له بنچینەدا دوو ( نون )ی جووڵه داره بەم شێوەیه :

﴿لَا تَأۡمَـنُـنَـا﴾

- تێکەڵ کردنی پیتێك به پیتێکی تر وەك تێکەڵ کردنی پیتی (زای) به (صاد) لەخوێندنەوەی پێشەوا (حمزة) لەووشەی : ﴿ٱلصِّرَٰطَ﴾ الفاتحة : ٦
- تێکەڵ کردنی جووڵه به جووڵەیەکی تر وەك تێکەڵ کردنی ( کسرة ) به ( ضمة ) لەخوێندنەوەی پێشەوا ( الکسائي ) و ( هشام )

نموونه :﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ﴾ البقرة : ١١

## تێبینی دەربارەی ئیشمام

- بۆ فێرکردنی کەسی نابینا ئەوا مامۆستا له ڕێگای هەستی دەستەوە فێری دەکات.
- پێشەوەی لێوەکان له کاتی ئیشمام ، وەك لەم وێنەیه دەردەکەوێت :



## سوودی ڕەوم و ئیشمام :

بریتی یە لە ئاشکرا کردنی جووڵەی بنەڕەتی پیتی کۆتایی، بەمەش جێگیر دەبێت لە کاتی گەیاندنی پیتی وەستاو لە سەری بۆ ئەوەی کەسی گوێ بیست لە کاتی ڕەوم بۆی دەرکەوێت کە جووڵەی پیتی کۆتایی چ جووڵە یەك بووە ، وە بۆ کەسی بینەریش لە کاتی ئیشمام دا دەرکەوێت کە جووڵەی پیتی کۆتایی چ جووڵە یەك بووە.

**بنچینەی ڕەوم :** ئەوپیتەی کە خوێنەر لەسەری دەوەستێ بە ڕەوم لە ڕووی قەڵەو و لاواز ، وەك باری گەیاندن مامەڵەی لەگەڵ دەکرێ ، نموونە :

| | | |
|---|---|---|
| ﴿ فَيَغْفِرُ ﴾ | لە کاتی گەیاندن | پیتی ( راء ) قەڵەوە |
| ﴿ فَيَغْفِرُ ﴾ | لە کاتی وەستان بە ڕەوم | پیتی ( راء ) قەڵەوە |
| ﴿ فَيَغْفِرْ ﴾ | لە کاتی گەیاندن | پیتی ( راء ) لاوازە |
| ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةِ ٱلْقَدْرِ ﴾ | لە کاتی وەستان بە ( ڕەوم ) | پیتی ( راء ) ناسك ( لاوازە ). |
| ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةِ ٱلْقَدْرِ ﴾ | لە کاتی وەستان بە سکون | پیتی ( راء ) ناسك ( لاوازە ) |
| ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةِ ٱلْقَدْرِ ﴾ | لە کاتی وەستان بە ( سکون ) | پیتی ( راء ) قەڵەوە |

**بنچینەی ئیشمام :** ئەو پیتەی کە خوێنەر لەسەری دەوەستێ بە ئیشمام لە رووی قەڵەو و لاواز کردن دا وەك باری وەستان کاری لەگەڵ دەکرێ.

نموونە:

| | | |
|---|---|---|
| ﴿فَيَغْفِرُ﴾ | لە کاتی وەستان بە سکون | پیتی ( راء ) قەڵەوە. |
| ﴿فَيَغْفِرْ﴾ | لە کاتی وەستان بە ئیشمام | پیتی ( راء ) لاوازە. |
| ﴿فَيَغْفِرْ﴾ | لە کاتی گەیاندن | پیتی ( راء ) لاوازە. |

## ئیشمام و رەوم نابێت لە سێ حاڵەت

| | | |
|---|---|---|
| ( هاء )ی مێینە کە نوسراوە بە ( هاء ) | (میم )ی کۆ | جووڵە( حركة )ی تووشهاتوو ( عارض ) |

( هاء )ی مێینە بریتی یە لەو ( هاء )ەی کە لکاوە بە کۆتایی ناوەکان وە بەڵگەیە لەسەر مێینێتی، لە کاتی گەیاندن بە ( تاء ) دەخوێندرێتەوە، وە لە کاتی وەستان بە ( هاء ) خوێنەر دەوەستی.

وەك : ﴿وَهُدًى وَرَحْمَةٌ﴾ الأنعام: ١٥٧

## شیکردنەوەی جۆرەکانی وەستان لە کۆتایی ووشە

**جۆری یەکەم** : پیتی کۆتایی ووشەکە ( **ساکن** ) بێت بە ( **سکون** ) ێکی بنەڕەتی:

وەك: ﴿فَحَدِّثْ﴾ الضحى:١١، ﴿فَٱنصَبْ﴾ الشرح: ٧، حوکمی وەستان و گەیاندن یەکسانە بە (**سکون**) ێکی تەواو (**محض**).

**جۆری دووەم** : پیتی کۆتایی ووشەکە جووڵاو بێت بە یەکێك لە سێ جۆرە ( جووڵەکان ): بە مەرج دانراوە پیتی کۆتایی ( **هاء** )ی راناو ( **ضمیر** ) و ( **هاء** )ی مێینە ( **تأنیث** ) و جووڵەی تووش هاتوو (**عارض**) نەبێت لە کاتی گەیاندن وە لە پێشیەوە پیتی درێژکراو و نەرم ( **اللین** ) نەبێت.

❖ ئەگەر پیتی کۆتایی جووڵاو بوو بە ( **فتحة** ) ئەوە تەنها بە ( **سکون** )ی تەواو خوێنەر بۆی هەیە بوەستی لەسەری ،

وەك : ﴿هُنَالِكَ﴾ آل عمران: ٣٨ ، ﴿ٱلْكَوْثَرَ﴾ الكوثر: ١ .

❖ ئەگەر پیتی کۆتایی ووشەکە جووڵاو بوو بە ( **ضمة** ) و تەنوین ( **ضمة** ) ئەوە دروستە بۆ خوێنەر لە کاتی وەستان بە سێ شێوە و جۆر بخوێنێت.

وەك : ﴿وَلَهُ ٱلْحَمْدُ﴾ التغابن: ١ ﴿عَدُوٌّ﴾ البقرة: ٣٦ ﴿وَمِنۢ بَعْدُ﴾ الروم: ٤



❖ ئەگەر هاتوو پیتی کۆتایی ووشەکە جولاّوو بوو بە ( کسرة ) و تەنوین ( کسرة ) ئەوە دروستە بۆ خوێنەر لە کاتی وەستان بە دوو شێوە و جۆر بخوێنێت ، وەك :

﴿وَٱلۡعَصۡرِ﴾العصر: ١ ، ﴿مِن مُّدَّكِرٖ﴾القمر: ١٥




## جۆری سێیەم :

١- ئەگەر هاتوو پێش پیتی کۆتایی پیتی درێژکردنەوەو نەرم ( اللين ) بوو ، وە پیتی کۆتاییەکە جوولاّو بوو بە ( فتحة ) لەم کاتەدا دروستە بۆ خوێنەر بە سێ شێوە بخوێنێت لەکاتی وەستان.

وەك : ﴿إِلَىٰ بَعۡضٍ ٱلۡقَوۡلَ﴾سبأ: ٣١



٢-ئەگەر پیتی کۆتایی ( کسرة ) بوو ئەوە لە کاتی وەستان بۆ خوێنەر دروستە بە چوار شێوە بخوێنێت.

وەك :

﴿يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ الحجر: ٣٥ ، ﴿إِلَّآ إِحۡدَى ٱلۡحُسۡنَيَيۡنِۖ﴾ التوبة: ٥٢

کورت ― مام ناوەند ― درێژ ― ڕەوم

## تێبینی

پیتی نەرم ( اللين ) لە کاتی وەستان بە ڕەوم درێژ ناکرێتەوە ، بە هیچ شێوەیەك حوکمی وەك حوکمی گەیاندن وایە ، بە پێچەوانەی پیتی درێژکردنەوە ( المد ) وەك : ﴿نَوۡمٞۚ﴾ البقرة: ٢٥٥ ﴿قَوۡمٞ﴾ التوبة: ٦

٣- ئەگەر هاتوو پیتی کۆتایی ( ضمة ) بوو ئەوە لە کاتی وەستان بۆ خوێنەر دروستە بە حەوت شێوە بخوێنێت ، وەك :

﴿نَسۡتَعِينُ﴾ الفاتحة: ٥ ، ﴿يَقُولُ﴾ البقرة: ٨ ، ﴿ٱلۡمِهَادُ﴾ آل عمران: ١٢.

کورت لەگەڵ ( سکون ) ― مام ناوەند لەگەڵ ( سکون ) ― درێژ لەگەڵ ( سکون ) ― ڕەوم لەگەڵ کورت ― کورت لەگەڵ ( ئیشمام ) ― مام ناوەند لەگەڵ ( ئیشمام ) ― درێژ لەگەڵ ( ئیشمام )

## جۆری چوارەم :

ئەگەر پیتی کۆتایی تەنوینی ( فتحة ) بوو ئەوە دەگۆڕێ بۆ پیتی ( الف ) لە کاتی وەستان.

وەك : ﴿حَكِيمًا﴾النساء: ١١ ، ﴿خَبِيرًا﴾ النساء: ٣٥ ، ﴿وَنِسَآءً﴾النساء: ١ ، ﴿جُفَآءً﴾ الرعد: ١٧.

## جۆری پێنجەم :

ئەگەر پیتی کۆتایی ( همزة ) یەکی جووڵاو بوو وە ( همزة ) کەش پیتی درێژکردنەوەی لە پێش هاتبوو ، کە ئەم جۆرەش درێژکردنەوەی بە یەك گەیشتووی پێ دەوترێت.

❖ ئەگەر ( همزة ) کە جووڵاو بوو بە ( فتحة ) ئەوە دروستە بۆ خوێنەر بە ( سكون )ی تەواو بوەستی بەسێ شێوە بخوێنێت ، واتە : ڕەوم وئیشمام نایگرێتەوە.

وەك :

﴿ٱلدِّمَآءَ﴾ البقرة : ٣٠



❖ ئەگەر ( همزة ) کە جووڵەدار ( متحرك ) بوو بە ( كسرة ) ئەوە دروستە بۆ خوێنەر بە چوار شێوە بخوێنێت لەکاتی وەستان ، وەك :

﴿ٱلدُّعَآءِ﴾ آل عمران : ٣٨

❖ ئەگەر ( همزة ) کە جووڵەدار ( متحرك ) بوو بە ( ضمة ) ئەوە دروستە بۆ خوێنەر بە هەشت شێوە بخوێنێت لەکاتی وەستان ، وەك :

﴿يَشَآءُ﴾ البقرة: ٢٨٤

## جۆری شەشەم :

ئەگەر پیتی کۆتایی شەددە بوو وە لە پێش شەددە کە پیتی درێژکردنەوە هاتبوو ، کە بریتی یە لە درێژکردنەوەی پەیوەست (اللازم).

❖ لە کاتی بە ( فتحة ) بوون خوێنەر تەنها بە ( سكون ) ێکی تەواو دەوەستی ، وەك: ﴿صَوَآفَّ﴾

❖ لە کاتی بە ( كسرة ) بوون بە دوو شێوە (وقف) دەکرێت لەسەری، وەك : ﴿ٱلدَّوَآبِّ﴾

❖ لە کاتی بە ( ضمة ) بوون بە سێ شێوە (وقف) دەکرێت لەسەری، وەك : ﴿وَٱلدَّوَآبُّ﴾

## جۆری حەوتەم :

ئەگەر پیتی کۆتایی ووشەکە ( هاء )ی ( کنایة ) بوو ئەوە رای زانایان لەرێ پێدان بە رەوم و ئیشمام سێ خال لەخۆدەگرێت :

١- هەندێك لە زانایان رێگەیان داوە بەلأم پێویستی بە روونکردنەوە هەیە.

٢- هەندێك لە زانایان رێگەیان بە رەوم و ئیشمام نەداوە لە هەموو کاتەکان ، چونکە ( هاء )ی کنایە هاوشێوەی ( هاء )ی مێینەیە ، ئیشمام و رەومیش ناچێتە سەر ( هاء )ی مێینە لە کاتی وەستان.

٣- هەندێك لە زانایان رێگەیان بە رەوم و ئیشمام داوە بە هەموو جۆرەکانی.

### رای زانایان دەربارەی ( هاء )ی راناو لە رەوم و ئیشمام



## روونکردنەوەی ( هاء )ي راناو لە کاتی خوێندنەوەی بە ڕەوم و ئیشمام

١- ئەگەر لە پێش پیتی (هاء)ی راناو پیتی (واو) یان ( ضمة ) هاتبوو.

وەك : ﴿ قَتَلُوهُ ﴾ النساء:١٥٧ ﴿ يَرْفَعُهُۥ ﴾ فاطر:١٠ ، ڕەوم و ئیشمام نابێت ، چونکە دەربڕینەکە قورسە ، خوێنەر تەنها بە ( سکون ) دەوەستێت لەسەر پیتی ( هاء ).

٢- ئەگەر لە پێش پیتی ( هاء )ی راناو پیتی ( ياء )ی ساکن یان ( مکسور ) هاتبوو، وە ( هاء )ـەکەش خۆی ( کسرة ) بوو ، ئەوە ڕەوم نابێت.

وەك : ﴿ بِوَٰلِدَيْهِ ﴾ الأحقاف: ١٥ ﴿ فَضْلِهِۦٓ ﴾ فاطر : ٣٠ ، چونکە دەربڕینەکە قورسە ، خوێنەر تەنها بە ( سکون ) دەوەستێت لەسەر پیتی ( هاء ) بەڵام ئەگەر جووڵەی پیتی ( هاء )ـەکە جیاواز بوو لەگەڵ جووڵەی پیتی پێش خۆی ئەوە دروستە بۆ خوێنەر بە ڕەوم و ئیشمام بخوێنێت ، ئەمەش لە گێڕانەوەی ( حفص ) لە دوو جێگا و شوێن هاتووە وەك :

﴿ أَنسَىٰنِيهُ ﴾ الكهف: ٦٣ ، ﴿ عَلَيْهُ ٱللَّهَ ﴾ الفتح: ١٠

٣- ئەگەر لە پێش پیتی ( هاء ) پیتی ( ألف ) یان ( فتحة ) یان ( سکون) یکی بنەڕەتی هاتبوو ئەوە دروستە بۆ خوێنەر بە ڕەوم و ئیشمام بخوێنێت ، و پارێزگاری لە جووڵەی ( هاء )ـەکە بکات لە کاتی دەرخستن، چونکە دەربڕینەکە قورس نیە وەك: ﴿ فَلْيَصُمْهُ ﴾ البقرة: ١٨٥،

﴿ عَلِمْتَهُۥ ﴾ ١١٦ ، ﴿ ٱجْتَبَىٰهُ ﴾ النحل: ١٢١

## تێبینی لەسەر( هاء )ـی گەیەندراو وجووڵەی تووشهاتوو/

١- پێویستە لە دەربڕینی پیتی ( هاء )ـی گەیەندراو بە ڕەوم ( صلة ) نەکرێت ، چونکە حوکمی وەك وەستان لەسەری وایە ، بەڵام لە ( هاء - كناية ) لە کاتی گەیاندن و وەستان هەر بە ( ساكن ) دەخوێندرێتەوەو ڕەوم و ئیشمامیش ناچێتە سەری ، وەك :

﴿أَرْجِهْ﴾ الأعراف: ١١١ ، ﴿اذْهَب بِّكِتَٰبِى هَٰذَا فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ﴾ النمل: ٢٨

٢-ڕەوم و ئیشمام ناچێتە سەر پیتێك جووڵاو بێت بە جووڵەیەکی تووشهاتوو .

وەك : ﴿وَأَنتُمُ الْأَعْلَوْنَ﴾ آل عمران: ١٣٩ ﴿أَنْ أَنذِرِ النَّاسَ﴾ يونس:٢

## خشتەی شیکردنەوەی جۆرەکانی وەستان بە هەرسێ شێواز

| ژ | جــۆر | جووڵەی پیتی کۆتایی | نموونە | ژمارەی شێوەکان لە کاتی وەستان لەسەری |
|---|---|---|---|---|
| ١- | لە بنەڕەتدا سکونە | سکون | ﴿وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَارْغَب﴾ | سکونی تەواو. |
| ٢- | بزواو لە کاتی گەیاندن بەڵام لە پێشی پیتی درێژکردنەوە و نەرم (المد ، اللين) نەبێت | فتحة | ﴿هُنَالِكَ﴾ آل عمران :٢ | سکونی تەواو. |
| | | كسرة | ﴿لِرَبِّكِ﴾ آل عمران: ٤٣ | ١- سکونی تەواو.<br>٢- ڕەوم. |
| | | ضمة | ﴿وَلَهُ الْحَمْدُ﴾ التغابن: ١ | ١- سکونی تەواو.<br>٢- ڕەوم.<br>٣- ئیشمام. |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | فتحة | ﴿ٱلْمَاعُونَ﴾ الماعون: ٧<br>﴿مَنْ أَسَرَّ ٱلْقَوْلَ﴾ الرعد: ١٠ | ١- سكونی تەواو لەگەڵ کورت (**قصر**) .<br>٢- سكونی تەواو لەگەڵ مام ناوەند (**توسط** ).<br>٣- سكونی تەواو لەگەڵ درێژ (**طول**) . |
| ٣- | درێژکردنـــەوەی سكونی توشهاتوو یـــــان درێژکردنـــەوەی نـــەرم (**المـــد العـارض للسـكون، مد اللين** ). | كسرة | ﴿ٱلْحِسَابِ﴾ النور: ٣٩<br>﴿ٱلْحُسْنَيَيْنِ﴾ التوبة: ٥٢ | ١- سكونی تەواو لەگەڵ کورت (**قصر**) .<br>٢- سكونی تەواو لەگەڵ مام ناوەند (**توسط** ).<br>٣سكونی تەواولەگەڵ درێژ(**طول**)<br>٤- ڕەوم لەگەڵ کورت. |
| | | ضمة | ﴿نَسْتَعِينُ﴾ الفاتحة:٥<br>﴿نَوْمٌ﴾ البقرة: ٢٥٥ | ١- سكونی تەواو لەگەڵ کورت (**قصر**)<br>٢- سكونی تەواو لەگەڵ مام ناوەند (**توسط** ).<br>٣- سكونی تەواو لەگەڵ درێژکردنەوە (**طول** ).<br>٤- ڕەوم لەگەڵ کورت (**قصر**) |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | | | ٥- ئیشمام لەگەڵ کورت (قصر).<br>٦- ئیشمام لەگەڵ مام ناوەند (توسط ).<br>٧- ئیشمام لەگەڵ درێژکردنەوە (طول ) . |
| ٤- | سێ جۆرە تەنوینەکە لەکاتی وەستان<br>(ـٌ)،(ـً)،(ـٍ) | فتحة | ﴿رَقِيبًا﴾<br>النساء : ١ | گۆڕین بە ( ألف ) |
| | | كسرة | ﴿تَكۡذِيبٍ﴾<br>البروج : ١٩ | ١- سکونی تەواو لەگەڵ کورت (قصر ).<br>٢- سکونی تەواو لەگەڵمام ناوەند (توسط).<br>٣- سکونی تەواو لەگەڵ درێژ (طول).<br>٤-رەوم لەگەڵ کورت (قصر) |
| | | ضمة | ﴿عَظِيمٌ﴾<br>البقرة : ٧ | ١- سکونی تەواو لەگەڵ کورت (قصر ).<br>٢- سکونی تەواو لەگەڵ مام ناوەند ( توسط ).<br>٣- سکونی تەواو لەگەڵ درێژ (طول ). |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | | | ٤- ڕەوم لەگەڵ کورت (قصر)<br>٥-ئیشمام لەگەڵ کورت ( قصر ).<br>٦- ئیشمام لەگەڵ مام ناوەند (توسط ).<br>٧- ئیشمام لەگەڵ درێژکردنەوە (طول ). |
| ٥- | درێژکردنەوەی بەیەك گەیشتوو (المَدُّ الواجِبُ المُتَصِلْ) | فتحة | ﴿ ٱلدِّمَآءَ ﴾ البقر : ٣٠ | ١- سکونی تەواو لەگەڵ مام ناوەند (توسط).<br>٢- سکونی تەواو لەگەڵ پێنج جووڵە.<br>٣- سکونی تەواو لەگەڵ درێژ (طول). |
| | | کسرة | ﴿ ٱلدُّعَآءِ ﴾ آل عمران : ٣٨ | ١- سکونی تەواو لەگەڵ مام ناوەند (توسط).<br>٢- سکونی تەواو لەگەڵ پێنج جووڵە.<br>٣- سکونی تەواو لەگەڵ درێژ (طول).<br>٤- ڕەوم لەگەڵ مام ناوەند (توسط). |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | | | ٥- رەوم لەگەڵ درێژکردنەوە (٥)جووڵە. |
| | | ضمة | ﴿يَشَآءُ﴾ البقرة: ٢٨٤ | ١- سکونی تەواو لەگەڵ مام ناوەند (توسط).<br>٢- سکونی تەواو لەگەڵ پێنج جووڵە.<br>٣- سکونی تەواو لەگەڵ درێژ (طول).<br>٤- رەوم لەگەڵ مام ناوەند (توسط).<br>٥-رەوم لەگەڵ درێژکردنەوە پێنج جووڵە.<br>٦- ئیشمام لەگەڵ مام ناوەند (توسط ).<br>٧-ئیشمام لەگەڵ درێژکردنەوە (٥) جووڵە<br>٨- ئیشمام لەگەڵ درێژ (طول). |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٦- | درێژکردنەوەی پەیوەست<br>( المَدُّ اللازِمُ المُخَفَّفُ الكَلمِيُّ ) | فتحة | ﴿صَوَآفَّ﴾ الحج: ٣٦ | سکون لەگەڵ درێژ ( **طول** ). |
| | | كسرة | ﴿ٱلدَّوَآبِّ﴾ الأنفال: ٢٢ | ١- سکون لەگەڵ درێژ ( **طول** ).<br>٢- ڕەوم لەگەڵ درێژ (**طول** ). |
| | | ضمة | ﴿وَٱلدَّوَآبُّ﴾ الحج: ١٨ | ١- سکون لەگەڵ درێژ ( **طول** ).<br>٢- ڕەوم لەگەڵ درێژ ( **طول** ).<br>٣- ئیشمام لەگەڵ درێژ ( **طول** ). |
| ٧- | ( هاء الكناية ) | | ﴿يَرۡفَعُهُۥ﴾ فاطر: ١٠ | سکونی تەواو. |
| | | | ﴿فَضۡلِهِۦٓ﴾ فاطر: ٣٠ | سکونی تەواو. |
| | | | ﴿قَتَلُوهُ﴾ النساء:١٥٧<br>﴿فَلَمَّا رَأَوۡهُ﴾ الملك:٢٧ | ١- سکونی تەواو لەگەڵ کورت (**قصر**).<br>٢- سکونی تەواو لەگەڵ مام ناوەند ( **التوسط** ).<br>٣- سکونی تەواو لەگەڵ درێژ (**طول**). |
| | | | ﴿فَأَلۡقِيهِ﴾ | ١- سکونی تەواو لەگەڵ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | ( دروستە بەڵام پێویستی بە روونکردنەوە هەیە) | | القصص:٧<br>﴿بِوَٰلِدَيۡهِ﴾<br>الأحقاف: ١٥ | کورت (قصر).<br>٢- سکونی تەواو لەگەڵ مام ناوەند (التوسط ).<br>٣- سکونی تەواو لەگەڵ درێژ (طول) |
| | | | ﴿فَلۡيَصُمۡهُۖ﴾<br>البقرة: ١٨٥<br>﴿مِّنۡهُۚ﴾ا<br>لنساء: ١٥٧ | ١- سکونی تەواو.<br>٢- رەوم.<br>٣- ئیشمام. |
| | | | ﴿عَلِمۡتَهُۥۚ﴾<br>المائدة: ١١٦<br>﴿دَلۡوَهُۥۖ﴾<br>يوسف: ١٩ | ١- سکونی تەواو.<br>٢- رەوم.<br>٣- ئیشمام. |
| | ( هاء الكناية )<br>( دروستە بەڵام پێویستی بە روونکردنەوە هەیە | | ﴿ٱجۡتَبَىٰهُ﴾<br>النحل: ١٢١ | ١- سکونی تەواولەگەڵ کورت(قصر).<br>٢- سکونی تەواو لەگەڵ مام ناوەند (التوسط).<br>٣- سکونی تەواو لەگەڵ درێژ.<br>٤- رەوم لەگەڵ کورت ( قصر ).<br>٥- ئیشمام لەگەڵ کورت ( قصر ). |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | | | ٦-ئیشمام لەگەڵ مامناوەند(التوسط)<br>٧- ئیشمام لەگەڵ درێژ ( طول ). |
| ٨- | ( هاء )ی مێینە ( التأنیث ) | فتحة | ﴿غِلۡظَةٗ﴾ التوبة: ١٢٣<br>﴿مَرَّةٖ﴾ التوبة:١٣<br>﴿إِخۡوَةٞ﴾ الحجرات: ١٠ | گۆڕین ( وەستان بە (هاء)ی ساکن ) |
| | | | ﴿نِعۡمَتَ﴾ إبراهيم: ٣٤ | سکونی تەواو. |
| | | كسرة | ﴿وَمَعۡصِيَتِ﴾ المجادلة : ٨ | ١- سکونی تەواو.<br>٢- ڕەوم. |
| | | ضمة | ﴿وَرَحۡمَتُ﴾ الزخرف: ٣٢ | ١- سکونی تەواو.<br>٢- ڕەوم.<br>٣- ئیشمام. |
| ٩- | توشهاتووی شێوە (شكل) | سێ جووڵە. | ﴿وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ﴾ آل عمران: ١٣٩<br>﴿أَنۡ أَنذِرِ ٱلنَّاسَ﴾ يونس: ٢ | سکونی تەواو بەبێ ڕەوم و ئیشمام. |

## خوێندنەوەی سورەتی ( الفاتحة )

## بۆ هەڵهێنجانی حوکمەکانی وەستان بە ( سکونی تەواو (محض) ڕەوم ، ئیشمام ):

أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَٰنِ الرَّجِيمِ وەستان تەواو ( تام )ـە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴿١﴾ وەستان تەواو ( تام )ـە

الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾ وەستان ڕێك ( حسن )ـە

- کورت ( القصر )
- ناوەند ( التوسط )
- درێژ ( الطول )

الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴿٣﴾ وەستان ڕێك ( حسن )ـە

- کورت ( قصر )
- ناوەند ( توسط )
- درێژ ( طول )
- کورت ( قصر ) لەگەڵ ( ڕوم )

مَٰلِكِ يَوْمِ الدِّينِ ﴿٤﴾ وەستان تەواو ( تام )ـە

إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴿٥﴾ وەستان تەواو ( تام )ـە

- کورت ( قصر )
- ناوەند ( توسط )
- درێژ ( طول )
- کورت ( قصر ) لەگەڵ ( ڕوم )
- کورت ( قصر ) لەگەڵ ( إشمام )
- ناوەند ( توسط ) لەگەڵ ( إشمام )
- درێژ ( طول ) لەگەڵ ( إشمام )

ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴿٦﴾ وەستان بەس ( كافي )ـە

صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ وەستان ڕێك ( حسن )ـە بەڵام چاك وایە بگەیندرێت.

غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧﴾ وەستان تەواو ( تام )ـە

تێبینی / شێوە و وێنەی لێوەكان لەكاتی ( ئیشمام )



# ( پچڕاو - جیاکراو )

# و

# ( گەیەنراو - لکێنراو )

# لە ووشەکان

# ( المقطوع والموصول من الكلمات )

## ( پچڕاو – جیاکراو ) و ( گەیەنراو – لکێنراو )
## لە ووشەکان
## ( المقطوع والموصول من الكلمات )

**پچڕاو :**

هەموو ووشە یەکی لێك جیا کراوە لە ووشەیەکی تر لە رەسم و وێنەی (مصحف)ی عوسمانی.

**یەکەم :** لەدە ( ١٠ ) شوێن زانایان هاودەنگ و هاوڕان[1] کە پیتی ﴿أَن﴾ لە ﴿لَّا﴾ جیاکراوە تەوە بە ریزبەندی ( متن الجزري )، وەك پێشەوا ( ابن الجزري ) دەفەرموێ :

وَاعْرِفْ لِمَقْطُوعٍ وَمَوْصُولٍ وَتَا فِي مُصْحَفِ الإِمَامِ فِيمَا قَدْ أَتَى

فَاقْطَعْ بِعَشْرِ كَلِمَاتٍ أَنْ لا مَـعْ مَـلْـجَإٍ وَلاَ إِلَـهَ إِلاَّ

وَتَعْبُدُوا يَاسِينَ ثَانِي هُـودَ لا يُشْرِكْنَ تُشْرِكْ يَدْخُلْنَ تَعْلُوا عَلَى

أَنْ لا يَقُولُوا لاَ أَقُـولَ...... ......................

---

[1]) ئەوەی کە را جیایی لەسەرە تەنها یەك شوێنە ئەویش بریتی یە لە ئایەتی : ﴿أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبْحَٰنَكَ﴾ الأنبياء: ٨٧ ٠ ووتەی پەسند جیاکراوە.

